زنجیرە کتێبی

# دیاری هاوسەران

بەرگی دووەم

**لەمپەرەکانی بەردەم هاوسەرگیری و لێکەوت و چارەسەرەکانی**

نوسینی

حەسەن عەلی بۆسکێنی

# بسم الله الرحمن الرحيم

وَأَنكِحُواْ ٱلۡأَيَٰمَىٰ مِنكُمۡ وَٱلصَّٰلِحِينَ مِنۡ عِبَادِكُمۡ وَإِمَآئِكُمۡۚ إِن

يَكُونُواْ فُقَرَآءَ يُغۡنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ ٣٢

(النور: ٣٢)

**پێشکەشە بە:**

هەردوو هاوسەرە زێدە بەڕێزو ئازیزەکانم

خاتوو: ( ڕابیعەخان، ڕێحان خان)

کە لە هەموو قۆناغەکانی ژیانمدا لێبڕاوانە و دڵسۆزانە

هاوبیرو هاوکارو هاوڕێ و هاوخەمم بوون.

# پێشەکی

الحمد لله رب العالمين ،والصلاة على المبعوث رحمة للعالمين، وعلى آله وأزواجه وذرياته وصحبه، والتابعين لهم بإحسان ويقين.

**خوێنەری خۆشەویست!**

بە پێی دەقەکانی قورئانی پیرۆزو سونەتەکانی پێغەمبەری ئازیز دەردەکەوێ کە هاوسەرگیری دەیان ئامانجی گەورەو گرنگ دەپێکێ، وە لە شەریعەتدا زۆر هاندانی بۆ کراوە، وە بەبێ. هۆ وازلێهانی لادانە لە سونەتی رسول الله عليه الصلاة والسلام، وە هاوسەر گیری لەو بابەتانەیە کە پێنج حوکمەکەی بە سەردا جێبەجێدەبێ، بە تایبەت لە کاتی بەربڵاوبوونی هۆکارەکانی خراپەکاری و وروژاندن، ئەمە بۆ هەردووک ڕەگەزە بێ جیاوازی.

بۆ ئاسانکاری هاوسەرگیری لە کۆمەڵگادا هەموو لایەک ئەرکی دەکەوێتە سەرشان، هەر لە دەوڵەت و وەزارەت و دەزگا پەیوەندی دارەکان و میدیاو و ڕۆشنبیران و مامۆستایانی ئاینی و باوکان و دایکان و کوڕان کچان، نابێ هیچ کەس لە بەرپرسیاریەتی ڕابکا، وە هەمووی بە پێی خۆی شانی بداتە بەر.

دیارە لە مرۆدا کەمتەرخەمی لە هەموو لایەکەوە هەیە سەبارەت بەم پرۆسەیە، هەر لە دەوڵەتەوە تا دەگاتە خودی کوڕو کچ، واتە لەمپەرو کۆسپەکان زۆرتربوون و سەختترو گەورەتربوون، بەڵام هەموولایەکمان بە پێی پێویست بەرچاو ڕوونیمان نییە سەبارەت بە لەمپەرەکان و لێکەوتەکانی و چارەسەرەکانی ، بۆیە ئەم کتابە تەرخان کراوە لە ناو ئەم زنجیرە کتێبە بە ناوی (دیاری هاوسەران) بۆ باسی لەمپەرەکان و لێکەوتەکانی و چارەسەرە

سەرەکانی، لە دوای ئەوەی کە لە بەرگی یەکەم دا سوپاس بۆ خوا باسی پێگەو ئامانجی هاوسەرگیری و خێزانمانکرد.

لە ڕاستیدا من بە کوردی کتێبی تایبەتم لەو بوارەدا بەرچاو نەکەوتوون، مەرج نییە نەبێ بەس من نەمدیوە، بەڵام بە زمانی عەرەبی چەند کتێبێک هەن ، بەڵام ئەو کتێبەی کە لە هەموویان زیاتر باسی لەمپەرەکانی کردووە بە ناوی(**عقبات الزواج وأخطارها الكبرى فى حياة أمتتنا الاسلاميه، المظاهر، الاسباب، العلاج**) طارق عند الواحد بن علي نووسیویەتی.

نووسەر زۆر بە جوانی باسی کۆسپەکانی کردووە، جا راستی من بۆ ناو و نیشانەکان سوود لەو وەردەگرم، بەڵام بۆ لێکدانەوەو وردەکاریەکان بە بیرو هزری خۆم دەینوسم و دایدەڕێژم. وە من زۆر دەستخۆشیم بۆ ئەم نوسەرە بە ڕێزە هەیە کە ئەو بە جوانی ئەم کارەی کردووە، منیش ئەم فکرە جوانانە دەگوازمەوە بۆ خوێنەری مسوڵمانی کوردی خۆشەویستم بە هیوای پاداشتی پەروەردگارو سوود گەیاندن بە هاونیشتیمانیانم.

بەشەکانی ئەم کتێبەش _ واتە بەگی دووەم _ بە پێکدێت لە سێ بەشی سەرەکی کە ئەمانەن:

**بەشی یەکەم: لەمپەرەکانی هاوسەرگیری.**

**بەشی دووەم: لێکەوتەکانی هاوسەرگیری.**

**بەشی سێیەم: چارەسەرەکانی.**

بە هیوای ئەوەی کە ئەم زنجیرە کتێبە کاریگەری باشی هەبێ لە بەختەوەری خێزانی و کەمکردنەوەی کێشەکانی و ئاشنابوونی هاوسەران بە ماف و ئەرکەکانیان و پەروەردەی مناڵەکانیان و بەرچاوڕونیان لە ئیسلام و ڕەواندنەوەی گومانەکان.

**حەسەن عەلی بۆسکێنی**

**ڕانیە**

# بەرایی

## خوێنەری سەنگین!

پرۆسەی هاوسەرگیری لەبەرئەوەی بابەتێکی گەورەو گرنگ و پیرۆزە لە ڕوانگەی شەریعەتەوە، بۆیە جێگای گرنگی پێدانی هەموو تاکێکی مسولْمانە. مسولْمان چ وەک تاک، چ وەک خێزان، چ وەک کۆمەڵگاو ئومەت بەرپرسە لەسەر خستنی و بە پایان گەیاندنی، هەموو کارێکی گرنگ و گەورە دیارە ئەوەش بەدەر نییە لە ڕووبەڕووبوونەوەی چەندین ئاستەنگ و ئاریشە، بۆیە نابێ کۆسپ و لەمپەرەکان چۆکدابدەن بە مرۆڤە خاوەن مەبدەء و ئازاکان. ڕاستە دواکەوتن و ساردبوونەوە هەیە بەڵام مرۆڤی خاوەن مەبدەء و ئازا بە چۆکداهاتن و پەککەوتن ناناسێ جا چ جای ئەو کەسە مسولْمانبێ و شوێن کەوتەی ڕەسول الله بێ (علیه الصلاە والسلام) کە هەموو دوونیای بە تەنیا گۆڕی و بە تەنیا دەستی پێکردو هەنگاوی یەکەمی نا و نەخشی جیهانێکی نوێ و تایبەتی دارشت.

دیارە لەمپەرو کۆسپەکان زۆرن و جۆراو جۆرن هەندێکیان پەیوەستن بە دەسەڵاتەوە، وە هەندێکیان پەیوەستن بە نەریتی کۆمەڵگاوە، وە هەندێکیان پەیوەستن بە دایک و باوکانەوە. هەندێکیان پەیوەستن بە خودی کچ و کوڕەکانەوە. هۆکاری میدیایی و سیستەمی جیهانی لایەنی ڕۆشنبیری وزۆر لایەنی تر هەیە لەمیانەی باسکردنی کۆی لەمپەرەکاندا بە پشتیوانی خوای پەروەردگار باسی لێوە دەکەین:

## لەمپەری یەکەم: بیانووگرتن بە قەزاو و قەدەر:

لێرەدا ناكرێ ڕوونكردنەوەی تەواو لەسەر قەزاو و قەدەر بدەین بە لام بە كورتی لە چەند خاڵێكدا ئەو بابەتە گرنگە ڕووندەكەمەوە بە پشتیوانی خوای گەورە:

١. ئازیزان! قەزاو قەدەر چوار قۆناغە:

قۆناغی یەكەم: زانیاری خوا بە هەموو شتێك بەر لە دروستبوونی و ڕوودانی شتەكە.

قۆناغی دووەم: نوسینی هەموو شتێك لە (لوح المحفوظ) بەر لە دروستبوونی و ڕودانی شتەكە.

قۆناغی سێیەم: بوونی ویست و ئیرادەی خوا لە سەر دروستبوون و ڕوودانی شتەكە.

قۆناغی چوارەم: بە دیهاتن و ڕوودانی شتەكە بەپێی ئەم سێ قۆناغەی پێشوو.

جا با بزانین دەكرێ بۆ سەرنەگرتنی هاوسەرگیری و نەكردنی و وەدی نەهاتنی بیانوو بە قەزاو قەدەر بگرین و پاڵی لێبدینەوەو هیچ خەم نەخۆیین؟

لە وەڵامدا دەڵێم نەخەیر ئەوە تەنیا بیانوو گرتنە بە قەزاو قەدەر، وەك وتراوە: ( عاجز الرأی مضیاع لفرصته، كلما فاته أمر عاتب القدر)

واتە: كەسی دۆڕاو هەموو كات دەرفەتەكان لە دەست دەدات ، جا هەركاتێك شتێكی لەدەست چوو سەركۆنەی قەزاو قەدەر دەكات.

باسی قۆناغی یەكەم و دووەم بە یەكەوە دەكەین، واتە: باسی زانین و نوسینی خودای پەروەردگار بە هەر شتێك بەر لە دروستبوون و ڕوودانی، ڕاستە خوای گەورە هەموو شتێك دەزانێ و نوسیویشیەتی بەر لە دروستبوون و ڕوودانی، بەڵام ئەوە بیانوو نییە بۆ هەوڵنەدان و خەمنەخواردن، چونكە چۆن

دەکرێ خوای گەورە شتەکان نە زانێ؟! بەڵام زانین و نوسینەکەی کەشف کردن و دەرخستنە نەوەک ناچارکردن و بە تۆبزی پێکردن، بۆ نموونە:

- زانایان پێش ڕوودانی ڕۆژگیران و مانگگیران هەواڵمان پێدەدەن بە ڕۆژەکەی و سەعاتەکەی و چۆنیەتیەکەی و کاتی دەرکەوتنەوەشیان، لە کاتێکدا زانیاری ئەوان ڕۆژەکە یان مانگەکە ناگیرێنێ، بەڵکو دەرخستن و ئاگادارکردنەوەیە.

- یان مامۆستایەک لە پۆلەکەی بە پێی هەڵسەنگاندنی خۆی دەڵێ فلان قووتابییەک نمرەی باشدێنێ، وە فلانیش خراپ دەبێ، دواتر هەڵسەنگاندنەکەی ڕاست دەردەچێ ، ئایا دەرچون و دەرنەچونی ئەو دوو قوتابیە لە بەر هەڵسەنگاندنی مامۆستاکەیە یان لەبەر هەوڵ و کۆششی دوو قوتابیەکە؟ بێگومان هۆکارەکە دەگەڕێتەوە بۆ دوو قوتابیەکە، کارەکەی مامۆستا تەنیا تەخمینکردن و هەڵسەنگاندنە.

- لە ئێستادا دەرکەوتووە تەنانەت زیندەوەرانیش بەر لە ڕوودانی شتەکان هەستی پێدەکەن و دەزانن.

بۆ نموونە: دووکەس سەیری فیلمێک دەکەن، یەکێکیان شارەزای تەواوی فیلمەکەیە، بەڵام ئەوی دییان هیچ لە فیلمەکە نازانێ، هەردووکیان سەیری فیلمەکە دەکەن یەکێکیان ئاگاداری تەواوی فیلمەکەیە و دەزانێ چۆن دەستپێدەکات و کاراکتەری سەرەکەی کێیە لە فیلمەکە؟ دەزانێ چۆن کۆتایی پێدێ، بەڵام ئەویتریان هیچ لە فیلمەکە نازانێ، ئایا زانین و نەزانینی ئەم دوو کەسە بە بە فیلمەکە کاردەکاتە سەر ناوەرۆکی فیلمەکە؟ بێگومان نەخەیر. ئایا دەکرێ زانایەک یان زیندەوەرێک شتێک بزانێ بەر لەڕوودانی بەڵام خودای پەروەردگار نەزانێ؟!

بێگوومان شتی وا نابێ ، خوای گەورە لە دەیان ئایەتدا بە ئێمەی وتوە  کە بە هەموو شتێک ئاگادارەو زانستی خوا دەورەی هەموو شتێکی داوەو هیچ شتێک لە خوای گەورە بزرنابێ بە پێی ئەم بەڵگانە:

١. { إنّ الله بكل شيء عليم } [ الأنفال: ٧٥ ] [ التوبة: ١١٥ ] [ العنكبوت: ٦٢ ]

٢. { إنّ الله قد أحاط بكل شيء علماً } [ الطلاق: ١٢ ]

٣. { وعنده مفاتح الغيب لا يعلمها إلاّ هو ويعلم ما في البرِّ والبحر و... } [ الأنعام: ٥٩ ]

٤. { لا يعزب [ أي: لا يغيب ] عنه مثقال ذرّة في السماوات ولا في الأرض } [ سبأ: ٣ ]

٥. { إنّه يعلم الجهر وما يخفى } [ الأعلى: ٧ ]

٦. { إنّ الله لا يخفى عليه شيء في الأرض ولا في السماء } [ آل عمران: ٥ ]

٧. { وسع ربّنا كلّ شيء علماً } [ الأعراف: ٨٩ ]

٨. { قل إن تخفوا ما في صدوركم أو تبدوه يعلمه الله ويعلم ما في السموات وما في الأرض } [ آل عمران: ٢٩ ]

٢. سەبارەت بە قۆناغی سێیەم: واتە ویستی خوای گەورە، ئەوە گومان لەوەدا نییە ئەوەی خوای گەورە ویستی لەسەر نەبێ نابێ وەک دەفەرموێ: وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ (التكوير: ٢٩)

واتە: ویستی ئێوەش نایەتە دێتە دی مەگەر کاتێک خوای پەروەردگاری جیهانیان بیەوێت، (هەرکەس ویستی خێری هەبێت خوای گەورە سەربەرستی لێ زەوت ناکات، لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەوە پێش دێت کە ویستی خوای لەسەرە و توانای تێگەیشتنمان لە نهێنی و شاراوەکان زۆر سنووردارە).

بەڵام هەر بە پێی قورئانی پیرۆز مرۆڤیش ویستی هەیە، وەک لە ئایەتەکەی پێشتردا باسی کردوە کە دەفەرموێ: لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ (التكوير: ٢٨)

واتە: بۆ ئەوانەتان کە دەیانەوێت ڕێبازی ڕاست و دروست بگرنەبەر.

کەواتە ویستی مرۆڤ لە ناو چوارچێوەی ویستی خوای گەورەدا جێگای دەبێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا وَإِن يَسْتَغِيثُواْ يُغَاثُواْ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ بِئْسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتْ مُرْتَفَقًا (الكهف: ٢٩)

واتە: بڵێ حەق (ئەم قورئانە) لەلایەن پەروەردگارتانەوە هاتووە جا هەرکەسێ دەیەوێت با باوەڕبێنێ و هەرکەسیش دەیەوێت با کافر بێت بەڕاستی ئێمە ئامادەمان کردووە بۆ ستەمکاران ئاگرێک کە بلێسەکەی (وەکو ڕەشماڵ) دەوریان دەدات وە ئەگەر (لە تینوانا) هاواری ئاو بکەن ئاوێکیان بۆ دەهێنرێ وەک مسی تواوە (یا وەک چڵک و چەپەڵی ڕۆن زەیت وایە) ڕوو دەم و چاوەکان دەبرژێنێ ئای چ خواردنەوەیەکی پیس و خراپە و ئای چ شوێن و جێگایەکی خراپە.

ئەگەر مرۆڤ ویستی نەبێ و توانای هەڵبژاردنی ڕێگای ڕاست و چەوتی نەبێ خوای گەورە سزای نادات.

٣. سەبارەت بە قۆناغی چوارەم واتە بەدیهێنانی شتەکان، خۆی بە دیهێنان لە خودی خۆیدا گەورەترین نیعمەت و بەهرەی خوایە بۆ مرۆڤ و تەواوی شتەکان، بۆ نموونە: هیچ کەسێکی ژیرو بە وەفا لۆمەی باوک و داکیان ناکەن لەسەر پەیدابوونی ئەوان، بەڵکو هەموو مرۆڤەکان خۆیان بە قەرزارو منەتباری باوک و داکیان دەزانن لە بەر ئەو نیعمەتی بوونە کە بوونە هۆکاری پەیدابوونی ئەم منالە.

٤. مرۆڤەکان ئازادن لە هەڵبژاردنی شتەکاندا، هەموو کەس هەست بەو ئازادییە دەکات.

**مرۆڤەکان لە بەردەم دوو حاڵەتدان:**

یەکەم: بەرامبەر شتانێک بێدەسەڵاتن وەک دروستبونی مرۆڤەکان، واتە نێرایەتی، مێیایەتی، جوانی، ناشیرنی، ... مرۆڤ لەبەرامبەر ئەو شتانەدا دەستەوستانەو بێدەسەڵاتە ئەوە مرۆڤ گوناهبار نابێ چونکە ئەو شتانە لە توانای مرۆڤدا نین. هەتا مرۆڤ لەسەر وەسوەسە، لە بیرچونەوە بە هەڵەداچوون، تۆبزی لێکران گوناهبار نابێ، بەڵام مرۆڤ لەسەر ئەو کارەی کە دەتوانێ بیکا یان نەیکا گوناهبار دەبێ بۆ نموونە نوێژ، ڕۆژو ، چاکە، خراپە، زینا، ڕیبا... مرۆڤەکان خۆشیان دەزانن کە ئازادن.

٥. مرۆڤەکان دەبن بە دوو جۆر:

جۆری یەکەم: بیانوو بە قەدەر دەگرن و بەڵام درۆ دەکەن.

جۆری دووەم: لە قەدەر تێدەگەن و بیانووی پێناگرن.

ئەگەر جۆری یەکەم پێی بڵێ نان مەخۆ، ئاو مەخۆ، شوو مەکە، ژن مەهێنە، لە سەر جادە بە ئاراستەی پێچەوانە بڕۆو سەرپێچی بکە، یان وەزیفەکەت جێبەجێ مەکە، ئایا ئەو کەسە ئامادەیە بە بیانووی قەزاو قەدەر ئەو کارانە بکا؟ بێگوومان نەخەیر، کەواتە کە باسی قەزاو قەدەر دەکا درۆ دەکا،بەڵکو بەس بیانو دەگرێ. ئەدی بۆ ئەو کارانە ناکا ئەگەر پێی وایە قەدەرە؟

٦. بابەتێکی تریش هەیە ئەویش ئەوەیە، ویست و ڕەزامەندی خوا لەیەک جودایە هەندێک جار، مەرج نییە ئەوەی خوای گەورە ویستی لەسەربوو پێی ڕازی بێ، بۆ نموونە هیچ شتێک بێ ویستی(إذن) خوا نابێ بەڵام مەرج نییە پێی ڕازیبێ بۆ نمونە تاوان و خراپەکاری وەک کوشتن و زیناو ڕیبا خۆری و

غەیبەت و ... بەڵام خوای گەورە پێیان ڕازی نییە هەر چەندە بە ویست و ئیزنی ئەو ڕوودەدەن.

خوای گەورە ئەو شتەی خۆشی دەوێ و پێی ڕازییە لە شەریعەتەکەی فەرمانی پێکردووەو پاداشتی بۆ داناوە، بەڵام ئەو شتەی نایەوێ و لێی ڕازی نییە لە شەریعەتەکەی نەهی لێکردووەو سزای بۆ داناوە.

٧. ئێمە غەیب نازانین، نازانین چی بۆ ئێمە بڕیاردراوە، کەواتە دەبێ باسی غەیب و شتی نادیار نەکەین و بیانوو نەگرین، خوای گەورە بە ئێمەی فەرمووە ئێوە زەواج و هاوسەرگیری بکەن وەک دەفەرموێ: وَأَنكِحُواْ ٱلْأَيَـٰمَىٰ مِنكُمْ وَٱلصَّـٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ إِن يَكُونُواْ فُقَرَآءَ يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ (النور: ٣٢)

واتە: ژن بدەن بە پیاوانی بێ ژن و ئافرەتانی بێوەژن بدەن بەشوو، هەروەها ژن بدەن بە بەندە صاڵحەکانتان و کەنیزەکە کانیشتان بدەن بە شوو ئەگەر هەژاریش بن، ئەوە خوا لە فەزڵ و بەخششی خۆی بەهرەوەریان دەکات، خوای گەورەش هەمیشە فراوانگیرو زانایە.

٨. خوای گەورە دەفەرموێ : وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَـٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ (النجم: ٣٩)

واتە: وە بێگومان ئادەمی جگە لە کۆششی خۆی خاوەنی هیچی تر نی یە. کەواتە مرۆڤ لە سەریەتی هەوڵبدا نەوەک بیانوو بە قەدەر بگرێ

٩. خوای گەورە دەفەرموێ ئەگەر ئێوە کاری باش بکەن خوا جلا جلالە، پێغەمبەرەکەی (علیه الصلاة والسلام)، بڕواداران کارەکان و بەری کارەکانتان دەبینن وەک دەفەرموێ: وَقُلِ ٱعْمَلُواْ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَـٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ (التوبة: ١٠٥)

واتە: ئەی موحەمەد (صلی الله علیه وسلم) بەوانە بڵێ کردەوە بکەن جا بێگومان خوا و فورستادەکەی و بڕواداران کردەوەکانتان دەبینن لەپاشان دەگەڕێنرێنەوە بۆ لای (خوای) زانای هەموو نهێنی و ئاشکراکان ئینجا هەواڵتان دەداتێ بەهەرچی کە ئێوە لە جیهاندا دەتان کرد.

باشە دامانا قەدەر هەر نەبوو کەواش نییە، هەموو شتێک بە قەزاو قەدەرە، ئایا مرۆڤ دەبێ هەوڵدا بۆ ئەوەی بە ئامانجەکانی بگا وەک خەڵکی ژێری ئەورووپاو هەموو وڵاتانی دوونیا، یان دەبێ پاڵداتەوە وەک بە زیوەکان؟!

١٠. هیچ کەس وەک پێغەمبەرو هاوەڵان و پیاو چاکان لە قەزاو دەر تێنەگەیشتوون، ئەی بۆ ئازاترین و باشترین و تێکۆشەرترین کەسبوون، نەوەک دواکەوتوو پاڵکەوتوو.

کەواتە چارەسەری ئەم بیانووە ئەوەیە:

- دەبێ پشت بە خوا ببەستین لە کارەکانمانداو دەست بگرین بە هۆکارەکانەوە.

- خوای گەورە داوای کارو کردەوەی لە ئێمە کردوە نەوەک پاڵدانەوە.

- خوای گەورە پێمان دەفەرموێ مرۆڤ تەنیا کۆششی خۆی دەستگیر دەبێ.

- دەبێ شارەزای یاسا شەرعیەکان و گەردونیەکان بین چونکە خاوەنی هەردووکیان خوای پەروەردگارەو هیچ ناکۆکییەک لە نێوانیاندا نییە.

- مرۆڤ هەر کارێکی لە توانا نەبو پێی مکلف نییەو گوناهبار نییە.

- پەروەردگار دادگەرەو دادگەری خۆشدەوێ و فەرمانی پێکردوە، ناکرێ مرۆڤ لەسەر کارێک سزا بدا کە خۆی پێی بکات.

- زانیاری خوا بۆ کاروکردەوەکانی ئێمە دەرخەرو کەشف کەرە، نەوەک ناچارکەر.

- ئەوانەی بیانوو بە قەدەر دەگرن بۆ خراپە شوێن شەیتان کەوتون کە وتی ئەی خوایە تۆ گومراتکردووم، بەڵام ئەوانەی سەرکۆنەی خۆیان دەکەون شوێن ئادەم کەوتوون و خۆیان تاوانبار دەکەن، خواش تەوبەی لێ قەبووڵکردو بۆ هەتا هەتایە ڕزگاری کرد.

- ڕاستە خوای گەورە ویستی ڕەهای هەیە هەرچی بیەوێ دەیکاو کەسیش ناتوانێ ڕێگری لێبکا، بەڵام خوای گەورە ستەم ناکاو لە پاڵ ویستی ڕەهای ئەودا جێگای ویستی ئێمەشی تێدا دەبێتەوە. وە زۆر کاتیش دژ بەیەک نین

- دونیا بۆ تاقیکردنەوەیە، وە تاقیکردنەوە بێ ئازادی نابێ، خوای گەورە ئەگەر بە تۆبزی خراپە بە مرۆڤ بکاو سزای بدا پێچەوانەی دادگەرییە کە خۆی فەرمانی پێکردوە جل جلالە.

- بە کورتی بەس دۆڕاو و بە جێماوەکان بیانوو بە قەزاو قەدەر دەگرن بۆ خراپە کردن، بەلام بڕوادارە تێگەئشتوەکان ئیمان بە قەزاو قەدەر دەکەنە پاڵنەرو هۆکاری بە هێزبوون و نەترسان و پێشکەوتن[1].

- قەزاو قەدەر بیانووی پێدەگیرێ لەسەر خۆڕاگری بۆ بەڵاو موسیبەت و شتە نەخوازراوەکان، نەوەک بۆ تاوانکردن و پاڵدانەوەو دواکەوتن،

- کەواتە بە پێی ئەو زانیاریانەی کە باسم کرد ناکرێ ژن نەهێنان و شوونەکردن بدەینە پاڵ قەزاو قەدەر بەلایەنی نەرێنی و بەرپرسیاریەتی لەسەر شانی خۆمان لابدەین، ئێمە دەبێ هەوڵی تەواو بدەین و هۆکارەکان بە دەستەوە بگرین و نزاو خێریش بکەین و خەڵکی باشیش ڕاسپێرین و پرسیش بکەین بە خەڵکی شارەزاو پسپۆر لەو بوارەدا، ئەگەر دوای هەموو ئەمانە کارەکە

[1] القضاء والقدر / الدكتور عمر سليمان الاشقر

سەری نەگرت دەبێ خۆڕابگرین و ڕازی بین بە بەشی خوا بەڵام نابێ لە کۆڵدان و نزاکردن بوەستین.

ئازیزان!

دیارە ئەم بابەتە زۆر هەڵدەگرێ ،بەڵام بەم ئەندازەیە کۆتایی بەو بابەیە دێنین، چونکە ئامانج ئەوەیە کە بیانووی ئەوانە ببڕین کە تاوان و تەمبەڵی لەسەر شانی خۆیان لادەدن و دەیدەنە پاڵ قەزاو قەدەر.[٢]

## دووەم: لەمپەری دەسەڵات و سیستەم:

جاری وا هەیە یاساو سیستەمی جوان هەیە بۆ ئاسانکاری پرۆسەی هاوسەرگیری، بەڵام دەسەڵات جێبەجێی ناکات، وە جاری وا هەیە سیستەم و یاساکە خۆی ئەم بابەتەی فەرامۆش کردووەو گوێی پێنادا لە ڕاستیدا هەردووکیان هەر کۆسپی گەورەن لە بەردەم هاوسەرگیریدا، چونکە دەبێ دەسەڵات و سیستەم هەردوک هاوکاربن بۆ ئەم کارە گرنگ و پیرۆزە بە تایبەتیش کە دەوڵەت خۆی بە شەرعی و جێبەجێکاری دینی ئیسلام بزانێ، بۆیە ئەرکی سیستەم و دەسەڵاتە کە :

١. ئاسانکاری بۆ پرۆسەی هاوسەرگیری لە یاسادا جێگیربکرێ بە تەواوی پێویستیە یاساییەکانەوە

٢. پێشینەی هاوسەرگیری جێگیر بکرێ هەم بە بێ بەرامبەر، هەم ئەگەر نەکرا بە قەرزی ئاسان

---

[٢] عقبات الزواج وأخطارها الكبرى في حياة أمتنا الإسلامية، المظاهر+ الأسباب+ العلاج/ طارق عبد الواحد بن علي.

٣. پێشینە بۆ دروستکردنی خانو، یان دروستکردنی شوقەو بە نرخی گونجاو بدرێ بەو کەسانەی هاوسەر گیری دەکەن

٤. قەرزی بچوک بکرێ بۆ ئەوەی گەنجان بێکار نەبن

٥. ڕەخساندنی هەلی کار هەم لە کەرتی گشتی، هەم لە کەرتی تایبەتی

٦. دانانی پلانی جوان و ڕێک و پێک بۆ پێدانی بیروکەی دۆزینەوەی کار بۆ گەنجان لە ڕێگای کەسانی بەهرەدارەوە

٧. دانانی پلانی جوان و گونجاو بۆ گەڕاندنەوەی ئەو سەدان هەزار گەنجەی کە ئاوارەی هەندەران بووە  کە لە بەرامبەر هەر یەکێکیان ئافرەتێک بێ هاوسەر ماوەتەوە ئەمە گرفتی گەورەی دروستکردووە.

## سێیەم: زیادەڕەویی لە مارەییدا:

مارەیی لە قورئانی پیرۆزدا کە پێی دەوترێ (مهر، صداق، اجر) هەموو ئەوانە ناون بۆ ئەو مارەییەی کە پیاو دەیدات بە خێزانەکەی.

### جابا بزانین فەلسەفەی مارەیی چییە؟

١. مارەیی ڕێزە بۆ ئافرەت لە لایەن شەریعەتی ئیسلامی پیرۆزەوە،  لەلایەن هاوسەرەکەیەوە، نەوەک قیمەت و نرخی ئافرەت وەک بێباوەڕان دەڵێن، ئەگەر مارەیی نرخی ئافرەت باییە دەبوو ئافرەت مافی فرۆشتنی خێزانەکەی و بەخشینی هەباییە، وەک پێشتر لای هیندۆس و ئەورووپیەکان هەبووە.

٢. مارەیی بەڵگەیە لە سەر جدییەتی پیاو لەسەر مەبەستبوونی ئافرەت، پیاو ئەگەر مەبەستی هاوسەرگیری لە گەڵ ئافرەتدا هەبێ دەبێت لە پێناوی ئەو مەبەستە قوربانی بدات.

٣. نیشانەی ڕاستی پیاوە لە گەڵ هاوسەرەکەی، چونکە (صداق) لە صدق و ڕاستیەوە هاتووە، دەبێ پیاو نیشانەی ڕاستی و ڕاستگۆیی بۆ هاوسەرەکەی نیشان بدات، ئەو مارەییە نیشانەیەکی باشی ئەو ڕاستی و ڕاستگۆیی و ڕاست بەڵێنییە بۆ هاوسەرەکەی.

٤. ئافرەت بەردەوام داواکراوە، چونکە سروشتی ئەواییە، بەڵام پیاو داواکارە، دەبێ داواکار قوربانی بدات.

٥. پیاو نەفەقەی لەسەر شانە بۆ خێزانەکەی، دەبێ ئامادەبێت ڕەنجی و شانی و ئارەقی نێوچاوانی کە لە هەر شتێک زیاتر پێیەوە ماندووبووە بیدات بە هاوسەری ژیانی و مناڵەکانی.

٦. ئافرەت ڕقی لە پیاوی بەخیل و چرووکە، بەخشندەیی پیاو هەر لە سەرەتاوە لە کاتی دانانی مارەیی و گواستنەوە دەردەکەوێ، بۆیە ئەمە نیشانەی سەخاوەتمەندییە بۆ پیاو، کە ئافرەت دەیبینێ لە هاوسەرەکەی لە کاتی دانان و پێدانی مارەییدا.

٧. ئافرەت بە سروشت حەزی لە جوانی و خۆڕازاندنەوەیە ئەمەش دەرفەتێکی باشی پێدەدات بۆ ئەوەی ئەو داخوازییەی بێتە دی، بۆ ئەم داخوازییە هاوسەرەکەی باشترین و بێ منەترین کەسێکە کە ئەوەی لێ داوابکات و بۆی بێنێتە دی.

٨. ئافرەتان شانازی بە پیاوەتی هاوسەرو بەخشندەیی هاوسەرانیان دەکەن، مارەیی پێدان ئەم شانازییەی ئافرەت وەدیدێنێ.

٩. ئافرەت گەرەکییەتی لە گەڵ هاوسەرەکەی ئەرکی ماڵداری بە ئەستۆوە بگرێ، جا ئەو مارەییەی کە خوای گەورە بۆی حەڵاڵ کردووە دەتوانی لەگەڵ هاوسەرەکەی بەشداری ڕاپەڕاندنی ئەرکی ماڵداری بکات.

١٠. زۆر جار ئەگەر ناخۆشی دەكەوێتە نێوان ژن و مێرد ئەگەر ئافرەتان مارەییەكی وەک پێویستیان نەبێت بێ ماف دەبن بە تایبەت كە پیاو هۆكاری جیابوونەوەكە بێت ، ئافرەت دوو جار زیانی بەردەكەوێ. جارێک لە دەستدانی هاوسەری و كچێنێتیەكەی و جارێک بواری مادیش زیانبار دەبێت، جا بۆیە مارەیی دەتوانێ برینێكیان سارێژ بكات لانی كەم.

١١. كەسی ماڵە خەزورانیش واتە: (ماڵی باوكی كچەكە)ش متمانەیان دەكەوێتە سەر زاواكەیان كە بە بێ منەتی مارەیی دەدات، دەزانن كە لەمەو دوا گرفتی نەفەقەشی نابێت.

١٢. ئەم مارەییە بێ منەتییە، چونكە خوای گەورە حەڵاڵی كردووەو بە ڕەوای داناوە، واتە ئافرەت كەس خێری پێناكات كە مارەیی پێدەدرێت، چونكە خوای گەورە بۆی ڕەوا داناوە.[٣]

١٣. زۆر جار ماڵی باوكان لە ئامادەكردنی جیهازی كچەكەیان كەمتەرخەمی دەكەن بە داخەوە ئێستاش ئەم گرفتە هەر ماوە، ئەگەر كوڕێک ژن بێنێ باوک و دایک هەموو هەوڵێک دەدەن، پارە قەرز دەكەن لە پێناوی كورەكەیان، بەڵام ئامادەنین جیهازو ئامادەكارییەكی وەک پێویست بۆ كچەكەیان بكەن، بۆیە جوان مارەییپێدان ئەم كەلێنەش پڕ دەكاتەوە.

١٤. بەڵێ پیاو ئەركی سەرشانی جێبەجێدەكات بە پێدانی مارەیی، بەڵام لە سەرێكەوە پیاوەتی و بەخشندەیی خۆی دەسەلمێنێ. هەم پاداشتی لای پەوەردگار مسۆگەر دەكات.

---

[٣] ڕۆژێک ئیمامی عومەر خوالێی ڕازی بێت وتاری دەدا، باسی ئەوەی دەكرد كە ئافرەتان مارەیی وەرمەگرن یا كە وەریشتانگرت، كەم وەرگرن و جۆرە قسانە. دەڵێن ئافرەتێک هەڵیدایە قسان و وتی: ئەی خەلیفەی ئیمانداران، خەریكی شتێكمان لێ حەرام دەكەیت، كە خوا ڕێی پێداوین؟ ئیمامی عومەر فەرمووی: (خەلیفە هەڵەی كرد و ژنێک پێكای.) (پێداچۆرەر)

١٥. مارەیی لە بەرامبەر ڕابواردن و لەزەت لە یەکتروەرگرتن نییە، چونکە ئەم لەزەت وەرگرتنە بۆ هەردووکیانە نەوەک تەنیا پیاو.

خوێنەری بەڕێز!

ئەمانەی باسکران کەمێکبوون لە حیکمەتی مارەیی، بەداخەوە زۆر کەمی لەسەر نوسراوە، بەڵام بابەتەکەی ئێمە لێرەدا ئەوەیە:[٤]

## ئایا دەبێ مارەیی چەند بێت؟

١. چۆن باشە؟
٢. ئایە دەکرێ مارەیی ببێتە لەمپەر لە بەردەم هاوسەرگیریدا؟

بۆ وەڵامی ئەو پرسیارانە دەڵێم:

١. دیارە مارەیی کۆمەڵێک حیکمەت و ئامانجی پیرۆزی هەیە وەک باسمان کرد، بەڵام ئامانجی سەرەکی نییە لە هاوسەرگیریدا، هەتا ئەگەر لە کاتی عەقدی هاوسەرگیریدا باسیشی نەکرێ مارەییەکە دادەمەزرێ دواتر پێویست دەبێت چ بە وەی کە پیاو لەسەر خۆیی پێویست دەکات، یان ئافرەت بە مەرجی بگرێ، یان بگوازرێتەوە.

٢. مارەی سنووری بۆ دیاری نەکراوە لە ڕووی شەرعییەوە کەم بێ هەر دەبێ، زۆر بێ هەردەبێ، ناوەندبێ هەر ڕەوایە. لێرەدا چەند شتێک گرنگە:

- ئەوەندە دابنرێ کە لە توانایاندا هەیە.
- ئەوەندەی دایاندا با وەفای پێبکەن.

---

[٤] المهر واحكامه/احمد محمود رجب رجب.
من قضايا الزواج/ جاسم محمد مهلهل
غلاء المهور واضراره/ عبد الله بن جار الله بن إبراهيم بن جا الله.

- ئەگەر گرفتێکی تێکەوت زوو چارەسەری بکەن، و نەبێتە هۆکاری تێکچوونی پرۆسەکە.

- پیاوان هەتا زوو بەڵێنەکانیان بگەیەننە سەر باشترو بێ کێشەتر و سەرکەوتووترە.

٣. مارەیی تا کەمبێ باشترە و بەرەکەتدارترە، هەر چەند ئەگەر زۆریشبێ ڕەوایە، وەک خوای گەورە دەفەرموێ: وَإِنْ أَرَدتُّمُ ٱسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُواْ مِنْهُ شَيْـًٔا أَتَأْخُذُونَهُۥ بُهْتَـٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا (النساء: ٢٠).

وَإِنْ أَرَدْتُمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنْطَارًا] وە ئەگەر هاتوو خێزانێکی ترتان هێنا وە قینتارێک مارەییتان پێیدا، واتە: سەد ڕەتڵ ئاڵتوونتان پێیدا، ئەوەندە زۆرتان دا [فَلَا تَأْخُذُوا مِنْهُ شَيْئًا] پاشان ئەگەر هاتوو تەڵاقت دا نابێ هیچ لە مارەییەکەی لێ بسەنیتەوە [أَتَأْخُذُونَهُ بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُبِينًا (٢٠)] ئایا ئێوە ئەو مارەییەیان لێ ئەسەننەوە بەبێ حەق ئەمە بوهتان و ناحەقییە وە تاوانێکی زۆر ئاشکرایەو حەرامە.

کەواتە ئەگەر قینتارێک مارەیی بدەی بە ئافرەت دروستە ئەوە مەفهومی ئایەتەکەیە، بەڵام ئەگەر لەو کاتانەدا توانای مادیی کەمبوو مارەییەکە کەمتر بێ باشترە.

٤. نابێ کۆمەڵگا، باوکان و دایکان، کچان مارەیی بکەنە کۆسپ و لەمپەر لە بەردەم پرۆسەی هاوسەرگیریدا، چونکە وا هەیە کوڕێکی باش هەیە یان خاوەن ژنێکی باش هەیە جا ژنی مابێ یان نەمابێ  مادام گونجاوەو ڕێک و پێکە دەبێ ئاسانکاری بۆ بکرێ، چونکە با ئێمە بیر لەوە بکەینەوە تەنیا کوڕان و کچان و تازە پێگەیشتووەکان هاوسەرگیری ناکەن بە لکو بەتەمەنەکان و  پیاوان و ژنانیش دەیکەن، مەبەستم لە زاراوەی ژن و پیاو

ئەوانەن کە پێشتر هاوسەرگیریان کردووە، نەوەک کوڕان و کچان ژن و پیاو نەبن.

## ئەندازەی مارەیی[٥]:

حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ ، حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ، أَنَّ امْرَأَةً جَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، جِئْتُ لِأَهَبَ لَكَ نَفْسِي. فَنَظَرَ إِلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَصَعَّدَ النَّظَرَ إِلَيْهَا، وَصَوَّبَهُ، ثُمَّ طَأْطَأَ رَأْسَهُ، فَلَمَّا رَأَتِ الْمَرْأَةُ أَنَّهُ لَمْ يَقْضِ فِيهَا شَيْئًا جَلَسَتْ، فَقَامَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَقَالَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنْ لَمْ يَكُنْ لَكَ بِهَا حَاجَةٌ فَزَوِّجْنِيهَا. فَقَالَ : " هَلْ عِنْدَكَ مِنْ شَيْءٍ ". فَقَالَ : لَا وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ : " اذْهَبْ إِلَى أَهْلِكَ فَانْظُرْ هَلْ تَجِدُ شَيْئًا ". فَذَهَبَ، ثُمَّ رَجَعَ، فَقَالَ : لَا وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا وَجَدْتُ شَيْئًا. قَالَ : " انْظُرْ وَلَوْ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ ". فَذَهَبَ، ثُمَّ رَجَعَ، فَقَالَ : لَا وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ، وَلَكِنْ هَذَا إِزَارِي. قَالَ سَهْلٌ : مَا لَهُ رِدَاءٌ فَلَهَا نِصْفُهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " مَا تَصْنَعُ بِإِزَارِكَ ؟ إِنْ لَبِسْتَهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْهَا مِنْهُ شَيْءٌ، وَإِنْ لَبِسَتْهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْكَ شَيْءٌ ". فَجَلَسَ الرَّجُلُ حَتَّى طَالَ مَجْلِسُهُ، ثُمَّ قَامَ، فَرَآهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُوَلِّيًا، فَأَمَرَ بِهِ، فَدُعِيَ، فَلَمَّا جَاءَ قَالَ : " مَاذَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ ". قَالَ : مَعِي سُورَةُ كَذَا، وَسُورَةُ كَذَا، وَسُورَةُ كَذَاعَدَّهَا، قَالَ : " أَتَقْرَؤُهُنَّ عَنْ ظَهْرِ قَلْبِكَ ". قَالَ : نَعَمْ. قَالَ: " اذْهَبْ فَقَدْ مَلَّكْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ ".

ئافرەتێک هاتووە بۆ کۆڕو مەجلیسی پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام،وتی: ئەی پێغەمبەری خۆم هاتوم خۆم ببەخشم بە جانابت، وە پێغەمبەریش تێهەڵڕوانی و پەسندی کرد بەڵام بۆ خۆی نا، بەڵکو بۆ بەشوودان،کاتێک کە ئافرەتەکە زانی کە پێغەمبەری خو بۆ خۆی نایەوێ لە وێ دانیشت چاوەڕوانی فەرمانی پێغەمبەری کرد علیه آلصلاة والسلام،یەکێک لە هاوەڵان هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر خۆت

[٥] رواه البخاری، ، ٥٨٧١. واه مسلم ١٤٢٥،

پێویستت پێی نییە لە منی مارە بکە، جەنابیان فەرموی: جا هیچت هەیە بیکەیە مارەیی؟ کابراش وتی نا واللە ئەی پێغەمبەری خوا، وتی بڕۆوە لای ماڵ و کەس و کارەکەت بزانە هیچت دەستدەکەویٚ،کابرا ڕۆیشت لە پاشان گەڕاوە وتی: واللە هیچم دەست نەکەوت ئەی پێغەمبەری خوا. لە پاشان جەنابیان فەرموی: بڕۆ ئەگەر موستیلەیەکی ئاسنیشت دەستکەون بیهێنە لە پاشان کابرا ڕۆیشتەوەو هاتەوە وتی ؛ واللە موستیلەیەکی ئاسنیشم دەستنەکەوت، بەڵام ازارەکەم ی ئەدەمیٚ (إزار) بەشی خوارەوەیە کە دەپۆشریٚ، (سەهل) دەڵیٚ:کابرا بەشی سەرەوەی نەبوو واتە ( رداء) واتە نیوەی پۆشاکی لە بەرکردنی نەبوو، لە پاشان پێغەمبەری خوا فەرموی: ئەگەر ئیزارەکەت بدەی بە ئەو ئەی چی بۆ خۆت دەپۆشی؟ ئەگەر خۆت بیپۆشی ئەوە هیچی بۆ ئەو نابیٚ و بەشی ئەو ناکا، وە ئەگەر بیدەی بەو ئەوە هیچ بۆ تۆ نابیٚ، کابرا لە مەجلیسەکەدا مایەوە، وە مەجلیسەکەش درێژەی خایان، لە پاشان کابرا هەستاو و ڕۆیشت پێغەمبەری خوا فەرمانی کرد کابرایان بانگکرد،کاتێک کابرا گەڕایەوە جەنابیان فەرموی هیچت قورئان لە بەردا؟ وتی بەڵیٚ : فڵان سورەت و فڵان سورەت و فڵان سورەتم لەبەردا، چەند سورەتێکی هەڵدا،پێغەمبەری خوا فەرمووی : دەتوانی ئەم سورەتانە بە لەبەر لە دڵەوە بخوێنی؟ فەرموی بەڵیٚ: فەرمووی : جا ئەوە لە تۆم مارەکرد بە و قورئانەی کە لە بەرتدا، واتە ئەوە ئاماژەیە بە کەمترین مارەیی کە ئافرەتی هاوەڵانی لەسەر مارەکرابیٚ، ئەمە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە مارەیی سنوری نییە چ بۆ زۆری، چ بۆ کەمی،

**مارەیی خێزانەکانی پێغەمبەری خوا عليه الصلاة والسلام:**

**حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ ، أَخْبَرَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ ، حَدَّثَنِي يَزِيدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُسَامَةَ بْنِ الْهَادِ ح، وَحَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ أَبِي عُمَرَ الْمَكِّيُّ، وَاللَّفْظُ لَهُ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ ، عَنْ يَزِيدَ ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّهُ قَالَ : سَأَلْتُ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : كَمْ كَانَ صَدَاقُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ**

وَسَلَّمَ ؟ قَالَتْ : كَانَ صَدَاقُهُ لِأَزْوَاجِهِ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ أُوقِيَّةً، وَنَشًّا، قَالَتْ : أَتَدْرِي مَا النَّشُّ ؟ قَالَ : قُلْتُ : لَا. قَالَتْ : نِصْفُ أُوقِيَّةٍ، فَتِلْكَ خَمْسُمِائَةِ دِرْهَمٍ، فَهَذَا صَدَاقُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِأَزْوَاجِهِ.[6]

ئەبی سەلەمە دەڵێ پرسیارم لە عائشە خێزانی پێغەمبەری خواکرد: مارەیی خێزانەکانی پێغەمبەری خوا چەند بووە؟ ئەویش وتی؟ دوازدە ئۆقیەو نەشێک بووە، وتیان نەش چەندە وتی نیبو ئوقیە، کەواتە هەمووی دەکاتە ٥٠٠ درهەم ئەوە مارەیی خێزانەکانی پێغەمبەربووە.

دیارە ئەوکات ٢٠٠ درهەم لە بەرامبەر ٢٠ مسقاڵ زێر بووە، کەواتە مارەییەکە دەکاتە نزیکەی ٥٠ میسقاڵ زێڕ، هەڵبەتە دەبێ ئەوەمان لە بەر چاوبێ ئەندازەی مارەیی بە پێی بەرزی و نزمی ئابوری کۆمەڵگاکان دەگۆڕێ. کەسێک لە ئەوروپا بژی جیاییە لە کەسێک لە ئەفریقا بژی

## مارەیی فاتیمەی کچی پێغەمبەر عليه الصلاة والسلام:

لە (سنن أبي داود) دا لە کتابی: النِّكَاحُ - بابی: ( فِي الرَّجُلِ يَدْخُلُ بِامْرَأَتِهِ قَبْلَ أَنْ يَنْقُدَهَا شَيْئًا[7].)

حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ الطَّالْقَانِيُّ ، حَدَّثَنَا عَبْدَةُ ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ ، عَنْ أَيُّوبَ ، عَنْ عِكْرِمَةَ ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ : لَمَّا تَزَوَّجَ عَلِيٌّ فَاطِمَةَ قَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " أَعْطِهَا شَيْئًا ". قَالَ : مَا عِنْدِي شَيْءٌ. قَالَ : " أَيْنَ دِرْعُكَ الْحُطَمِيَّةُ ؟ ". حكم الحديث: حسن صحيح[8]

ئیبن عەباس دەفەرموێ: کاتێک عەلی فاتیمەی داخوازی کردو مارە بڕی پێغەمبەری خوا فەرمووی : شتێکی بدەرێ بە مارەیی، ئەویش وتی: هیچم لا نییە،جەنابیشیان فەرمووی ئەی کوانێ زرێیە حوتەمیەکەت؟

---

[6] ـ واه مسلم ،١٤٢٦
[7] رواه أبو داود. ٢١٢٥
[8] مسند أحمد، ٦٠٣

واتە: ئەوی بۆ بکە بە مارەیی.

أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ ، عَنِ ابْنِ أَبِي نَجِيحٍ ، عَنْ أَبِيهِ ، عَنْ رَجُلٍ سَمِعَ عَلِيًّا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يَقُولُ : أَرَدْتُ أَنْ أَخْطُبَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ابْنَتَهُ، فَقُلْتُ : مَا لِي مِنْ شَيْءٍ فَكَيْفَ ؟ ثُمَّ ذَكَرْتُ صِلَتَهُ وَعَائِدَتَهُ فَخَطَبْتُهَا إِلَيْهِ، فَقَالَ : " هَلْ لَكَ مِنْ شَيْءٍ ؟ " قُلْتُ : لَا. قَالَ : " فَأَيْنَ دِرْعُكَ الْحُطَمِيَّةُ الَّتِي أَعْطَيْتُكَ يَوْمَ كَذَا وَكَذَا ؟ " قَالَ : هِيَ عِنْدِي. قَالَ : " فَأَعْطِنِيهَا ". قَالَ : فَأَعْطَيْتُهَا إِيَّاهُ. حكم الحديث: حسن لغيره وهذا إسناد ضعيف.

ئەم فەرموودەیە باس لەوە دەکا کە زرێیەکی داوەتێ کام مارەیتە بەرەکەتدارە؟

مسند أحمد - مُسْنَدُ الصِّدِّيقَةِ عَائِشَةَ بِنْتِ الصِّدِّيقِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا حَدَّثَنَا يَزِيدُ ، أَخْبَرَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ ، عَنِ ابْنِ سَخْبَرَةَ ، عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ ، عَنْ عَائِشَةَ ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ : " أَعْظَمُ النِّسَاءِ بَرَكَةً أَيْسَرُهُنَّ مَئُونَةً [٩]

دیارە وشەی ( مئونة) مەسرەف و مارەیی دەگرێتەوە.

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : (خَيْرُ النِّكَاحِ أَيْسَرُهُ) رواه أبوداود.

واتە: باشترین مارە برین ئەوەیە کە ئاسانتربێ

پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: مُسْنَدُ الصِّدِّيقَةِ عَائِشَةَ بِنْتِ الصِّدِّيقِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ إِسْحَاقَ ، قَالَ : حَدَّثَنَا ابْنُ مُبَارَكٍ ، عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ سُلَيْمٍ ، عَنْ عُرْوَةَ ، عَنْ عَائِشَةَ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : " إِنَّ مِنْ يُمْنِ الْمَرْأَةِ تَيْسِيرَ خِطْبَتِهَا، وَتَيْسِيرَ صَدَاقِهَا، وَتَيْسِيرَ رَحِمِهَا ". حكم الحديث: إسناده حسن.

لە بەرەکەتی ئافرەت ئەوەیە: داخوازی ئاسانبێ، مارەیی ئاسانبێ، ڕەحمی ئاسان و بەرەکەت داربێت.

وە دەفەرموێ: خَيْرُ الصَّدَاقِ أَيْسَرُهُ» أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُد، وَصَحَّحَهُ الْحَاكِمُ[١٠]

---

[٩] مسند أحمد، ٢٥١١٩

[١٠] روه أبو داود وصححه الحاكم، ٢١١٧

واتە: باشترین مارەیی ئەوەیە کە ئاسان تر بێت.

هەروەها پێغەمبەری خوا ئوم حەبیبەی مارەکرد لە سەر چوار هەزار ٤٠٠٠ درهەم، بەڵام مارەییەکە پاشای حەبەشە خستیە ئەستۆی خۆی. کەچی پێغەمبەری خوا هیچ نارەزایی دەرنەبڕی.

کەواتە مارەیی بە پێی گونجان و توانای مادییە، بەڵام نابێ لە کاتی بێ ئیشی و کەم دەرامەتی داوای مارەیی زۆر بکرێت و بکرێتە پەرچ و لەمپەر لە بەردەم هاوسەرگیری.

## لەمپەری چوارەم: زۆری داواکاری ماددی ژن و کەسوکاری

مەبەست لەو داواکاریە ناپێویستانەیە کە ئەرکی هاوسەرییەتی زۆر گران و ئاڵۆز دەکەن، دیارە ئەو داواکاری و مەسرەفانە بە پێی داب و نەریتی کۆمەڵگاکان جیاوازی هەیە، من زیاتر ئەگەر باسی دابونەریتی کوردەواری بکەم ئەوە بەشێکی زۆری زۆر زیادڕەوی تێدا دەکرێ، کارەساتەکە ئەوەیە کە کەسێکی هەژار بیەوێ هاوسەر گیری بکات!! دیارە مەسرەف و پارە سەرفکردن هەر لە بینینی کەس و کارەوە بۆ کاتی داخوازی، بۆ کاتی مارەیی، بۆ کاتی گواستنەوە، بۆ کاتی شیرین خواردنەوەو سێ ڕۆژانە و هەفتیانە، بە تایبەتیش کۆمەڵێک زیادەڕەویی لە لە هێنانی تیپی مۆسیقاو و گۆرانی بێژو گرتنی شوێنی تایبەتی و ...هتد. ئەوە بێجگە لە داواکاریەکانی ناو ماڵ، وە زیادەڕەویی لە جل و بەرگ و جوانکاری و گەڕان بە دوی بەدلەی گران و ئارایشگای گران و سەیارەی گرانبەهاو مانەوە لە هوتێلی گران و چی وچی!! ئەمانە بێجگە لەوەی بەشێکیان هەر خراپن لە ڕووی شەرعییەوە، بەڵام زۆریش زیادەڕەویی تێدا دەکرێ بە داخەوە!!

ئەگەر بێت و ئەرکی هاوسەرگیری ئەوا قورس بکرێ بێگوومان گەنجان لێی ڕادەکەن و بیر لە هاوسەرگیری ناکەنەوە، کە خوای گەورە ڕەحمەتی بۆ ئێمە دەوێ نەوەک زەحمەتی خوای گەورە دەفەرموێ:

- يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ (البقرة: ١٨٥) واتە: خوای گەورە ئاسانکاری بۆ ئێوە دەوێ زەحمەت و قورسی بۆ ئێوە ناوێ

- وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُواْ مَيْلًا عَظِيمًا (النساء: ٢٧) واتە: بێگومان خوا دەیەوێت تەوبە و پەشیمانیتان لێ وەربگرێت و لە هەڵەکانتان خۆش بێت، (بەڵام) ئەوانەی شوێن ئارەزووات و هەوەسبازی کەوتوون دەیانەوێت ئێوە لابدەن بە لادانێکی گەورە.

- هەتا زانایان یاسایان داڕشتوە بۆ ئاسانکاری کە دەفەرموون: ( المشقة تجلب التيسير، یان دەڵێن : إذا ضاق الامر اتسع) [11]وە چەندین یاسای تریان دارشتووە لە سایەی ئایات و فەرموودەکان.[12]

- ئەوەی من دەمەوێ بیڵێم ئەوەیە هەرکەسێک ئەرکی هاوسەرگیری قورس بگا چ جای بگاتە پەکخستن ئەوە گوناهبار دەبێ، لە تاوانەکان و لێکەوتەکانی بەشدار دەبێ، بۆیە بەراستی حەیف و عارە تەکالیف و داواکاری ناپێویست و بێشەرعی پەکی ئەم بابەتە گەورەو گرنگ و پیرۆزە بخا،لە کاتێکدا ئەمە لەسەر ڕێگای هەموو خێزانیکدا هەیە، بۆیە با هەموومان قۆڵی مەردایەتی لێهەڵماڵین و ئاسانکاری بۆ بکەین و ڕێگا تەخت کەین و لەمپەرەکان لابەرین.

---

[11] المختصر في القواعد الفقهية / صلاح الدين احمد
[12] عقبات في طريق الزواج محمد بن عبد الله الهبدان

## لەمپەری پێنجەم: شوێنی نیشتەجێبوون

گومان لەوەدا نییە کە شوێنی نیشتەجێبون هۆکاری بەختەوەرییە و یەکێکە لە پێداویستیەکانی ژیان، هاوسەران پێویستیان بە ماڵێکە تێیدا بژین، وە تێیدا پارێزراوبن، عەیب و عارو کەموکوڕیان داپۆشن، بەڵام دیارە ئەو خانووە مەرج نییە لە بەردەستدا هەبێ بە تایبەت لەمڕۆدا و لە هەرێمی کوردستاندا، بۆیە با ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکەین لەم بوارەدا:

١. ئەگەر کوڕەکە ماڵێکی لەو شێوەیەی هەبوو ئەوە بەخشش و نیعمەتی خوایە، مانای وایە گرفتێکی گەورەیان لێقەبۆتەوە.

٢. ئەگەر خەریکی دروستکردن و پەیداکردنیشی بوو ئەوەش هەر ئاسانە و بەهرەی خوایە، مانای وایە لە کاتێکی نزیکدا چاوەڕێی جێگە و ڕێگەی خۆیان دەکەن.

٣. یان هیچ کام لەوانە نییە، بەڵام کوڕەکە دەتوانێ خانوویەک بە کرێ بگرێت، ئەمەش هەر چارەسەرە و کێشەی نییە.

٤. بەڵام کە نەتوانی بە کرێی بکرێ وا دەبێ ماڵی باوکی کورەکە جێگا و ڕێگایان هەیە و شوێنی سەربەخۆیان دەستدەکەوێ، ئەمەش بەشێکە لە چارەسەر، جا هەرکاتێک توانای مادییان بوو دەتوانن خانووی سەربەخۆ دەستبخەن.

٥. جاری وایە کەسوکاری ژن بۆ نموونە باوک یان برا دەڵێ: من خانوی زیادم هەیە، یان نەهۆمی سەرەوەم هەیە پێتدەدەم تا جێگاو ڕێگایەک پەیدا دەکەی، ئەمەش بەشێکە لە چارەسەر، بەڵام بە مەرجێک بە منەت و خراپە نەشکێتەوە بەسەر کوڕەکەدا، بەڵام ئەگەر بەدڵی فراوان و بێمنەت بوو با قەبوڵی بکات، ئەوە باشترە لەوەی کە ببێتە گرفت لە بەردەم دروستکردنی خێزان.

٦. جاری وایە بیانووی ئەوە هەیە ژن ئامادە نییە لە خانووی باوک و دایکی کوڕەکە دابێ بە بیانووی ئەوەی کە ئازاد نابێ، یان لە نێوان بوک و خەسودا بەردەوام ناکۆکی هەیە، لە ڕاستیدا ئەم بابەتە بەشێک لە ڕاستی تێدا، بەڵام هەموو حاڵەتەکان ڕاست نییە، بووکی وایە بە خەسوو و دژەکانی خەنی بووە ئەوەندەی هاوکاری و کارئاسانی بۆ دەکەن، جاری وایە ئەم ژنە کارمەندە، یان خوێندکارە، یان نەخۆشە لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا زۆریش باشە بۆ ئەو، لە ڕاستیدا ئەوەی لە سەر بووک و خەسوو دەوترێ هەمووی ڕاست نییە، ئەوە دەکەوێتە سەر ئیمان و ویژدان و ژیری و لێکتێگەیشتنی خۆیان، ئەوان دەتوانن زۆر بە ئاسانی بەسەر ئەو کۆسپانەدا زاڵبن، ئەگەر جار جار گرفتێک هەبێ ئەوە هەموو شتێک قابیلی چارەسەرە.

وەک وتمان سەربەخۆی خێزان لە ماڵی سەربەخۆدا بەشێکە لە بەختەوەری، وە سەربەخۆی تەواو بۆ ئەو خێزانە دروستدەبێت، بەڵام ئەگەر نەشمان بوو با هیوامان هەبێ. زۆربەی ئەوانەی کە ئێستا تۆ دەیانبینی خاوەنی خانوو و سەیارە و باخ و کەلوپەلن، کاتی خۆی سەرەتای هاوسەر گیرییان خاوەنی هیچ نەبوون، بۆیە مرۆڤ دەبێ بە هیواوە بژی، گومانی باش بە خوا بەرین، لێرەدا گەرەکمە چەند خاڵێکی گرنگە باس بکەم:

١. لە فەرموودەی قودسیدا هاتووە: سنن الدارمي - وَمِنْ كِتَابِ الرِّقَاقِ. - بَابٌ: فِي حُسْنِ الظَنِّ بِاللهِ ٢٧٧٣ (المجلد : ٣ الصفحة : ١٧٩٦): أَخْبَرَنَا أَبُو النُّعْمَانِ ، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْمُبَارَكِ ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ الْغَازِ ، عَنْ حَيَّانَ أَبِي النَّضْرِ ، عَنْ وَاثِلَةَ بْنِ الْأَسْقَعِ ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : " قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى : أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي، فَلْيَظُنَّ بِي مَا شَاءَ ".حكم الحديث: إسناده صحيح[١٣]

[١٣] - رواه مسلم، ٢٢٢٣

کە خوا دەفەرموێ: من بە پێی گومانی بەندەکەمم بە من جا چی گومان دەبا بە من با بیبا. کەواتە با گومانی باش بە خوا ببەین و هەوڵی خۆشمان بدەین

هەروەها لە فەرموودەدا هاتووە:

وَحَدَّثَنِي حَجَّاجُ بْنُ الشَّاعِرِ ، حَدَّثَنِي مُعَلَّى بْنُ أَسَدٍ ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ مُخْتَارٍ ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ عَتِيقٍ ، حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ سِيرِينَ ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " لَا عَدْوَى ، وَلَا طِيَرَةَ ، وَأُحِبُّ الْفَأْلَ الصَّالِحَ ".

کە پێغەمبەر فەرموویەتی (عدوی) نییە، واتە درم و لێگرتنەوە نییە، مەبەست ئەوە نییە هیچ جۆرە نەخۆشییەک ناگوازرێتەوە مەبەست ئەوەیە بە بێ هۆکارو بە هێزی خۆی ناگوازرێتەوە بەڵکو بە فەرمانی خواو بە هۆکار دەگوازرێتەوە، وە فەرمووی ( طیرة) نییە، مەبەستی ئەو شتە بووە کە عەرەبەکان بیانویستبا کارێک بکەن باڵندەیەکیان هەڵدەدا ئەگەر بە لای ڕاستدا فریبا پێیان وابوو ئەوە کارەکە خێرە دەبێ بیکەن، وە ئەگەر بەلای چەپدا فریبا دەیانوت ئەوە زیانی هەیە نەیان دەکرد، واتە ئەوەندە دواکەوتووبوون خێرو شەڕیان لەم باڵندەیە یان لە بەردێک کە لە دیوێکیان دەنوسی بیکە، وە لە دیوەکەی تردا مەیکە دەبینییەوە، بەڵام پێغەمبەری خوا دەیفەرموو من (فأل) باشم خۆشدەوێ، مەبەستی گومانی باش و هیوای باشبوو

کەواتە ئێمە لە هەوڵدا دەبین بۆ دابین کردنی جێگاو ڕێگا بە هەر شێوەیەکی ڕەواو مەشروع ، وەک باسمان کرد ئەرکی دەوڵەت و خودا پێداوانیشە کە لەم بوارەدا هەنگاو هەڵبگرن و کار بۆ هاوسەران ئاسان بکەن. سیستەمی دروستکردن و پێدانی شوقە بە قیست کارێکی باشە، بەڵام بە نرخی گونجاو و قیستی درێژخایەن بۆ ئەوەی گەنجان بەهرەمەند بن.

جاری وایە کوڕەکە جێگاکەی بچووکە یان کۆنە، ئەوە نابێ ببێتە کێشەو تانەی لێبدرێ، چونکە گرنگ کوڕو کچەکەن ئەگەر ئەوان ڕازیبن ئێمە نابێ ڕێگریان بین و توانج و پلاریان تێبگرین.

## لەمپەری شەشەم: ئیشوکاری کوڕە داخوازیکارەکە

ئەم بابەتە گرنگە لە کۆمەڵێک خاڵدا ڕووندەبێتەوە:

١. دەبێ یەقینمان بەوە بێ کە خوای گەورە ڕۆزی دەرە و ڕزق و ڕۆزی لە دەستی ئەودا بە پێی ئەم بەڵگانە:

أ. وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا وَيَعۡلَمُ مُسۡتَقَرَّهَا وَمُسۡتَوۡدَعَهَاۚ كُلّٞ فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ (هود: ٦) واتە: هیچ زیندەوەرێک نیە لەم زەویەدا ڕزق و ڕۆزیەکەی لەسەر خوا نەبێت و ئاگادارە بەشوێنی حەوانەوە و شوێنی دەرچوونیان، هەموو شتێک تۆمارە لە دۆسیەی ئاشکرادا لە (لوح المحفوظ) دا.

ب. مَّا يَفۡتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحۡمَةٖ فَلَا مُمۡسِكَ لَهَاۖ وَمَا يُمۡسِكۡ فَلَا مُرۡسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ (فاطر: ٢) واتە: هەر کاتێک خوا دەروازەی ڕەحمەت و بەخششی خۆی لە خەڵکی بکاتەوە، ئەوە هیچ کەس و هیچ شتێک ناتوانێت بەری بگرێت، هەر کاتێکیش دەروازەی ڕەحمەتی بگرێتەوە و دای بخات، کەس ناتوانێت لە دوای گرتنەوەکەی خوا بێجگە لە خۆی بیکاتەوە، ئەو زاتە هەر خۆیشێ باڵادەست و دانایە.

ت. وَإِن يَمۡسَسۡكَ ٱللَّهُ بِضُرّٖ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَۖ وَإِن يُرِدۡكَ بِخَيۡرٖ فَلَا رَآدَّ لِفَضۡلِهِۦۚ يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۚ وَهُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ (يونس: ١٠٧) واتە: ئەی ئینسان) ئەگەر خوا تووشی ناخۆشی و زیانێکت بکات، ئەوە هیچ کەس ناتوانێت فریات بکەوێت و لەسەرتی لابەرێت جگە لەو زاتە، یاخود ئەگەر بیەوێت تووشی خێر و خۆشیەکت بکات، ئەوە هیچ کەس ناتوانێت بەری فەزڵ و بەخششی خوا بگرێت، هەر کام کە بیەوێت لە

بەندەکانی بەهرەوەر دەکات (لە نازو نیعمەتانی بێشومار) ئەو زاتە هەمیشە لێخۆشبوو میهرەبانە.

ث. إِنَّ رَبَّكَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا (الإسراء: ٣٠) واتە: بەڕاستی پەروەردگارت ڕزق و ڕۆزی فراوان دەکات بۆ هەر کەسێک کەبیەوێ و وەتەنگی دەکات بۆ هەرکەسێ بیەوێ بەڕاستی ئەو هەمیشە ئاگاو بینایە بە بەندەکانی.

ج. وَلَوْ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزْقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوْاْ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ مَّا يَشَآءُ إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرٌۢ بَصِيرٌ (الشورى: ٢٧) واتە: خۆ ئەگەر خوا ڕزق و ڕۆزی فراوان بکردایە بۆ بەندەکانی لە زەوی دا ستەمیان دەکرد بەڵام (خوا) ڕزق و ڕۆزی بەو ئەندازە دەنێرێتە خوارەوە کە خۆی بیەوێ بەڕاستی خوا بە ئاگا و بینایە بە بەندەکانی.

ح. وَٱللَّهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ فِى ٱلرِّزْقِ فَمَا ٱلَّذِينَ فُضِّلُواْ بِرَآدِّى رِزْقِهِمْ عَلَىٰ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ فَهُمْ فِيهِ سَوَآءٌ أَفَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ (النحل: ٧١) واتە: وە خوا باوی هەندێکتانی داوە بەسەر هەندێکتاندا لە (پێدانی) ڕۆزی دا جا ئەوانەی کە باودراون ڕۆزیەکەیان ناگێڕنەوە (و بەشی ناکەن) بەسەر بەندەکانیاندا تا بەهۆی ئەوەوە ئەوان (بەندەکان و) ئەمان یەکسان بن تێیدا دەی ئایا ئەوانە ئینکاری چاکەو نیعمەتەکانی خوا دەکەن.

ئەم ئایەتە پیرۆزانە بە ڕوونی پێماندەڵێن کە خوای گەورە ڕۆزی دەری هەموو زیندەوەرانە لە زەویدا پێمان دەڵێ خەزێنەی ڕزق و ڕۆزی لای ئەوە، وە پێمان دەڵێن: خوای گەورە جیاوازی بە ڕزق و ڕۆزی بەندەکان کردوە، وە خوای گەورە بەندە ناسە لە وانەیە لە بەندە خۆشەویستەکانی خوا هەبن کە لە بەرامبەر هەبوندا خۆ ڕانەگرن، یان بە پێچەوانەوە، وە دەرگایەک خوای گەورە بیکاتەوە بە کەس داناخرێ، وە بە پێچەوانەوە، وە فەرمانیشی پێکردووین هەوڵ بدەین.

٢. لە کۆمەڵێک فەرموودەدا پێغەمبەری ئازیز عليه الصلاة والسلام پێمان دەفەرموێ: " مَنْ أَصْبَحَ مِنْكُمْ آمِنًا فِي سِرْبِهِ ، مُعَافًى فِي جَسَدِهِ، عِنْدَهُ قُوتُ يَوْمِهِ، فَكَأَنَّمَا حِيزَتْ لَهُ الدُّنْيَا ". هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لَا نَعْرِفُهُ إِلَّا مِنْ حَدِيثِ مَرْوَانَ بْنِ مُعَاوِيَةَ، وَحِيزَتْ : جُمِعَتْ. حكم الحديث: حسن[١٤]

دەفەرموێ: هەر کەس لە ئێوە بەیانی بکاتەوە لە ناو ماڵ و مناڵ و کەس و کاری خۆی، وە ساغ و سەلامەت بێ لە لاشەییدا،وە ڕۆزی ئەو ڕۆژەی لابێ، ئەوە وەک ئەوە وایە دونیا هەموو هی ئەو بێ

وە دەفەرموێ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : " قَدْ أَفْلَحَ مَنْ أَسْلَمَ، وَرُزِقَ كَفَافًا ، وَقَنَّعَهُ اللَّهُ بِمَا آتَاهُ .[١٥]

واتە: سەربەرزو سەلامەت ئەو کەسەیە مسوڵمان بێ و گەردن کەچی خوا بێ، وە بایی خۆی ڕزق و ڕۆزی پێبدرێ، وە خوای گەورە قەناعەتی بدا بەوەی کە پێی بەخشیوە،

هەمدیس دەفەرموێ: ( اللَّهُمَّ اجْعَلْ رِزْقَ آلِ مُحَمَّدٍ قُوتًا .) [١٦]

واتە: ئەی پەروەردگارا ڕزق و ڕۆزی ئالی موحەمەد بدەی بایی ئەوەی کە بەشیان دەکا

بۆچی ئەو فەرمودانەمان هێنا؟

دیارە مەبەستمان ئەوە نییە کە مرۆڤ هەوڵ نەدا، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە کە مرۆڤ هەڵپەو کاری نا بەجێ نەکا بۆ ئەوەی ڕۆزی دەست کەوێت.

٣. ئەو کەسەی داوای کچەکەت یان خوشکەکەت دەکات، لە چوار حاڵان بە دەرنییە:

---

[١٤] رواه الترمذی، ٢٣٤٦

[١٥] رواه مسلم، ١٠٥٤

[١٦] ـ رواه مسلم، ١٠٥٥

یەک: ئەو کەسە کارێکی حەڵاڵی هەیە و داهاتێکی مام ناوەندی هەیە، ئەوە بۆ ئەو کەسە هیچ سڵ مەکەوە بۆ ئەوەی وەڵامی داخوازیەکەی بدەیەوە.

دوو: یان ئەو کەسە داهاتێکی حەڵاڵی زۆری هەیە، بەڵام لەوانەیە ئەوان پێیان وابێ کارێکی خاوەن سومعەو شەرەف مەندانە نییە، لێرەدا مادام کچەکەت یان خوشکەکەت ڕازییە سڵی لێمەکەوە، چونکە مادام حەڵاڵە کارەکە نا شەریفانە نییە، لەوانەیە خوێندنەوەی تۆ هەڵە بێ دەکرێ  تۆ خوێندنەوەی خۆت بگۆڕی، یان مەرج نییە خەڵکان ئەم  کارە بە شەرەفمەندانە نەبینن.

سێ: یان داهاتی هەیە، بەڵام پیس و ناشەرعییە، ئەوە ئەوکات کە ئەو کەسە ئامادە نەبێت کەسابەت و کارەکەی بگۆڕێ ئەوە دڵت بە داهاتەکەی خۆشنەبێ، وە پێت وانەبێ ماڵی پیس و حەرام کچەکەت یان خوشکەکەت بەختەوەر بکات.

چوار: یان ئەو کەسە هیچ داهاتێکی نییە و کارێکی دەستگیر نەبووە، بەڵێ مافی خۆتە داوای داهات و کاری لێبکەی، بەڵام دەی تۆش هیمەت بنوێنە کاری بۆ بدۆزەوە، وە یەقینیشت بە خواو ڕزق و ڕۆزی خوا هەبێت.

کەواتە زۆربەی کاتەکان لەمپەرەکان واقعی نین.

دیارە ئەوە بە نیسبەت کەس و کاری کچەوە ، بەڵام خۆ دەبێ کەسوکارو هاوڕێکانی کوڕەکەش هیمەت بکەن و ئاسانکاری بکەن بۆ هاوسەرگیری ئەو کەسەی کە دەیەوێ هاوسەرگیری بکات، لە ڕاستیدا بە شێوەیەکی گشتی لە وەڵاتی ئێمە بە گشتی و هەرێم بە تایبەت تەمبەڵییەک ڕووی کردۆتە گەنجانمان و هەر دەڵێن کار نییە، زۆربەی یان لە هەندەرانە، یان لە ڕێگادا، یان بە تەمایە بڕوا، بۆیە ئەمە وای کردوە بیر لە پڕۆژەو کارو هاوسەرگیری و داهاتوو و گۆڕانگاری نەکەنەوە، بۆیە با هەموو لایەکمان هاوکاربین بۆ بواری

هاوسەرگیری با بابەتی کارو کاسبی لە حەدی پێویست زیاتر زەق نەکەینەوە و نەیکەینە لەمپەرو کۆسپ.

## لەمپەری حەوتەم: لەمپەری خزمایەتی خزمایەتی کچەکە یان کوڕەکە

ئەم بابەتە دوو لایەنی هەیە:

یەکەم: ئەوەیە کە هەندێک کەس هاوسەرگیری لە گەڵ خزمانی خۆیان ناکەن جا چ کورەکە بێ یان کچەکە، ئەوەش بە بیانووی جۆراو جۆر، جاری وایە دەڵێ دەڵمان لێک سپی بۆتەوە و ڕێزو شکۆی یەکتر ناپارێزین، جاری وایە دەڵێن وەک برام وایە، یان وەک خوشکم وایە، یان جاری وایە خۆم بە کوڕی ماڵی ئەوان داناوە،یان خۆم بە کچی ماڵی ئەوان داناوە جا چۆن هاوسەرگیری لە گەڵدا بکەم، یان جای وایە پێی وایە، چونکە خزمی یەکترن وەک پێویست مافی یەکتر نادەن ، یان دەوترێ لە ڕووی زانستی و تەندروستی خراپە، هەڵبەتە هەموو ئەوانە کۆمەڵێک بیانوون دەکرێ هەندێک ڕاستیان تێدابێ، بەڵام ئەگەر ئامانجە گەورەکان لەو هاوسەرگیرییەدا هەموو وەدیبێن دەبێ واز لەو بیانوانە بێنن.

سەبارەت بابەتی خراپبوون و تەندروست نەبوونی هاوسەر گیری لە گەڵ خزمدا ئەوە کاتێک خراپە کە نەخۆشی لە ناویاندابێ، بەڵام لەمرۆدا لە ڕێی پشکنینی پزیشکی دەتوانین خۆمان دڵنیا بکەین لەو بابەتە خۆ ئەگەر نەخۆشی هەبوو، وە چارەسەریشی نەبوو ئەوە دەکرێ بابەتەکە بە هەند وەربگیرێ.

دووەم: مەبەست لە خزمایەتی شتێکی ترە، بۆ نموونە کوڕوکچێک هاوسەرگیریان کردوەو سەرکەوتوو نەبوون دواتر کە بیانەوێ لە گەڵ خزمی یەکتر یان هاوڕێ و ناسیاوی یەکتر هاوسەرگیری بکەن ئەوان ڕێگر دەبن و

پرۆسەکە تێکدەدەن، یان باوکەکە یان دایکەکە دەڵێ مادام لەگەڵ خزمەکەی من تێکتدا من خزمایەتیت ناکەم، هەڵبەتە ئەگەر هۆکاری لێک جودابونەوەکە بە ستەم و خراپە کاری بووبێ و وە کەسەکە تەوبە نەکردبێ ئەوە بیانووەکە لە جێی خۆیدا، بەڵام ئەگەر جیابوونەوەکە هۆکاری ڕەوای بوبێ، یان خۆیان چاکردبێ هەق نییە ڕێگریان لێ بکرێ لە هاوسەرگیری لە گەڵ خزمی یەکتر چونکە مەرج نییە لە گەڵ ئەو فەشەلی هێنابێ لەگەڵ ئەویش فەشەل بێنێ و سەرکەوتوونەبن.

## لەمپەری هەشتەم: بیانووگرتن بە ڕەوشت و هەڵس و کەوتی داخوازیکار

ڕەوشتی بەرز لە هەموو کەسێکدا داواکراو و گرنگە، مرۆڤ بە ڕەوشتە بەرزەکانی گەورە دەبێ و خۆشەویست دەبێ و بەرپرسیاریەتی هەڵدەگرێت:

١. ڕەوشتی بەرز بەرهەمی بیرو باوەڕی ڕاست و دروستە، گومان لە وەدا نییە کە بیرو هزری ڕاست و ڕەوان ڕەوشتی بەرز بەرهەم دێنێت.

٢. قوڵبوونەوە لە بەندایەتی زیاتر ڕەوشت و ئاکاری بەرز لە مرۆڤدا دێنێتەدی، نوێژ ئەو کاتە نوێژە کە دورمان خاتەوە لە تاوانی گەورەو بچوک، ئاشکراو نەهێنێ، لە گەڵ خۆمان و دەورووبەرمان، زەکات بۆ ئەوەیە لە سیفەتی چروکی خۆپەرستی ڕزگارمان بکا، فێری بەزەیی و میهرەبانی بین، بۆئەوەیە فێری هاوکاری و دەستگیرۆیی بین ، بۆ ئەوەیە بتوانین خۆشی و ناخۆشی لە گەڵ خەڵکدا دابەش بکەین، ڕۆژو بۆ ئەوەیە فێری پەروەردەی دەروونی بین، وە فێری دادگەری بین، وە بتوانین جڵەوی هەواو ئارەزوەکانمان بخەینە دەستخۆمان، بۆ ئەوەی بتوانین لە خوا ترس و پارێزکاربین، حەج بۆ ئەوەیە خوا لە خۆمان ڕازی بکەین، بۆ ئەوەیە بە ماڵ و گیانمان بەخشندەو لێبڕاوبین، بۆ ئەوەیە بە دروشمەکانی حەج دینداری و ئیمانمان باڵا ببەین، بۆ ئەوەیە

شارەزای خەڵکانی تری دونیا بین و بە ژیان و گوزەرانیان ئاشناو ئاگاداربین و هاوبەشی خۆشی و ناخۆشیەکانیان بین، وە زیکرو نزا بۆ ئەوەیە خۆمان بە ئاتاج و موحتاجی خوای گەورە بزانین، بۆ ئەوەیە ناخمان بە خوا ناسی ئاوەدان بکەینەوە، مەرامی قوربانی و سەدەقەو هۆزەبانە هاوکاری کردنی هەژارانەو شوکری نیعمەتەکانی خوای گەورەیە.

٣. ڕەوشتە بەرزەکان هەندێکیان هەموو مرۆڤایەتی لە سەری کۆکن وەک دادگەری، ڕاستی، لێبووردەیی، وەفا، ئازایەتی، بەخشندەیی، ڕقبوونەوە لە ستەم. هەموو ئەو ڕەوشتانە شەریعەت زۆر تەئکیدی لە سەر دەکاتەوەو وردەکاریەکانی باسدەکا، وە لە ڕوانگەوە ئیسلامەوە ڕەوشت زۆر فراوانەو هەموو بوارەکانی ژیاندەگرێتەوە، ڕەوشتی دەوڵەتداری، ڕەوشتی سیاسی، ڕەوشتی ئابوری، ڕەوشتی کۆمەڵایەتی، ڕەوشتی خێزانداری، ڕەوشتی تاکەکەسی، وە ڕەوشت لەماڵەکردندا، وە لەکاتی جەنگ و ئاشتەواییدا.

٤. پابەندبوون بە ڕەوشت زۆر هۆکاری هەیە لە هەموویان گرنگترو کاریگەرتر دینە، نەریتە، یاسایە، ویژدان و بەرپرسیاریەتی هەڵگرتنە، هەموو ئەوانە لە چوارچێوەی دیندا جێگایان دەبێتەوە.

٥. ئەوەی کە پەیوەندی بە بابەتی ئێمەوە هەیە ئەوەیە تاچەند دەکرێ ڕەوشتی داخوازیکار ببێتە لەمپەر لە بەردەم هاوسەرگیریدا؟

**ڕەوشتەکان سێ جۆرن:**

جۆری یەکەم: کەمتەرخەمی لە ئەرکەکان و پابەندبوونی ڕەوشتی کۆمەڵایەتی هاوسەرگیری.

دووەم: زیادەڕەوی کردن لە ڕەوشتەکان بۆ نمونە زیادەڕەویی لە توڕەبووندا،

جۆری سێهەم: هاوسەنگییە

بە نیسبەتی جۆری یەکەم دەبێتە گرفت ئەگەر بێت و خەمساردی و بە خەمەوە نەبوون زۆربەی بواری کەسەکە بگرێتەوە، بۆ نموونە لە ڕووی بژێوی ژیانەوە، یان لە ڕووی هەڵگرتنی بەرپرسیاریەتی خێزان ئەگەر کەسەکە کەمتەرخەمیەکەی زۆربوو ئەوە گرفت دروستدەکا، ئەگەر جۆری دووەم بوو وەک تێپەڕاندن، ئەویش کە لە سنور تێپەڕێ  ئەویش گرفتە، بۆ نموونە توڕەبوونی زۆر سەردەکێشێ بۆ شەڕو ئاژاوە، یان غیرەی زۆر، ئەوەش سەردەکێشێ بۆ تاڵبوونی ژیان، بۆیە دەبێ ئەم ڕەوشتانە چارەسەر بکرێن و لە گەڵ هەندێکیشیان خۆمان بار بێنین، واتە مەرج نییە هەموو شتێک وەک ئەوەی لێبێ کە ئێمە دەمانەوێ، دیارە ئەم ڕەوشتانە پێش هاوسەرگیری جیاوازن لە دوای هاوسەرگیری، چونکە ئەگەر پێشتربێ دەتوانین بڕیاری ئەرێنی و نەرێنی بدەین، یان مەرج بۆ کەسەکە دابنێین، بەڵام دواتر چاککردنی سەختترەو زیاتر پێویستی بە ئارامگرییە.

٦. دەبێ ئەوە بزانین کە هیچ کەس لە کەموو کوڕی بەدەرنییە، نە کوڕی خەڵک و نە کچی ئێمە،یان بە پێچەوانەوە بۆیە ئەگەر ئەو بنەمایەمان زانی باشتر دەتوانین ئارامگرو سەرکەوتووبین لە پرۆسەکەدا.

٧. با هەڵنەخەڵەتێین لە ژیانی خەیاڵی ناو دراما و فیلمەکان، چونکە ئەوانە بە شێوەی  خەیاڵی دادەنرێن،  بە کردەوەش دەرکەوتوە هیچ کەس بە ئەندازەی ئەکتەرەکان و مۆدێرنەکان فەشەلیان نە هێناوە لە خێزانداری، هەیانە بە شانازییەوە دوازدە جار تەڵاقی وەرگرتووە، بۆیە دەبێ وریا بین ژیان لە واقیعدا جیاوازە لە ناو فیلم و دراماکان.

٨. بۆ دڵنیابوون لە ڕەوشتی کەسی داخوازیکار دەکرێ پرسیار لە هاوڕێ و مامۆستاو جیران و هاوپیشە و کەسە نزیکەکانی بکەین، دەکرێ خۆمان ژیری و توانای هەڵسەنگێنین و قسەی لە گەڵدا بکەین، وە گرنگە فێری ئامانجەکانی خێزانداری و ئەرکەکانی و جوانیەکانی و گرفتەکانی بکەین.

٩. بۆیە لەمپەربوون و لەمپەرنەبوونی ڕەوشتی داخوازیکار هەمووی لە یەک ئاستدا نییە، هەر مرۆڤە بۆ خۆی جیهانێکەو سەربەخۆییە، گرنگ ئەوەیە گەشبین بین، وە لە هەمانکاتدا وریابین، جاری واش هەیە زەمەن بەشێکە لە چارەسەر، خەمخۆری کەس و کارو هاوسەران زۆر کاریگەری هەیە بۆ بەختەوەری ئەوان.

لە کۆتایدا با لەم دەقانە ئاگادار بین لە باسی ڕەوشت و هەڵس و کەوتی کەسی بڕوادار:

- ﴿لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَٰهَدُوا۟ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ﴾ (البقرة: ١٧٧).

واتە: کرداری چاک و کاری باش تەنها بریتی نیە لە ڕووکردنتان بەرەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا (چونکە جولەکە زۆر لەسەر گۆڕانی قیبلە دووان و پڕو پاگەندەی زۆریان کرد)، بەڵکو کرداری چاک و کاری باش بریتیە لەوەی کە ئادەمیزاد باوەڕی هێنابێت بە خواو بە ڕۆژی دوایی و بە فریشتەکان و بەکتێبەکان و بە پێغەمبەران، هەروەها ماڵ و سامانی بەخشی بێت ـ لەگەڵ خۆشەویستیدا بۆی ـ بەخزمان و هەتیوان و هەژاران و ڕێبواران و داواکاران و لە پێناوی ئازادکرنی بەندەکاندا؛ هەروەها نوێژی بەچاکی ئەنجام دابێت و زەکاتیشی لە ماڵ و سامانی دەرکردبێت و ئەوانەی وەفادارین بەپەیمانەکانیان کاتێک پەیمانیان دابێت، ئەوانەش کە لە کاتی نەداری و هەژاری و نەخۆشی و ناخۆشی و کاتی جەنگ و شەڕو شۆڕدا ئارامگرن، ئا ئەوانە کەسانێکن ڕاستیان کردووە و هەر ئەوانەشن پارێزکارو خواناس و دیندارن.

- وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا (الإسراء: ٢٣)

واتە: وە پەروەردگارت بڕیاری داوە کە هیچ شتێ نەپەرستن بێجگە لە ئەو وە لەگەڵ دایک و باوکتان چاکە بکەن ئەگەر یەکێکیان (باوکت و دایکت) یان هەردووکیان لای تۆ پیربوون قسەی ناخۆشیان پێ مەڵێ تەنانەت ئۆفیش وە تێیان مەخوڕە و پێیاندا هەڵمەشاخێ (بەڵکو) وتەی نەرم و شیرینیان (لەگەڵدا) بەکاربێنە.

- وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا (الإسراء: ٢٤)

واتە: باڵی خۆ بەکەم زانینیان بۆ ڕابخە لەبەر بەزەیی و میهرەبانیت پێیان بڵێ ئەی پەروەردگارم ڕەحمیان پێ بکە هەرچۆنێ ئەوان منیان پەروەردە کرد بە منداڵی.

- رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِي نُفُوسِكُمْ إِن تَكُونُواْ صَٰلِحِينَ فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلْأَوَّٰبِينَ غَفُورًا (الإسراء: ٢٥) پەروەردگارتان زۆر زاناترە لە خۆتان بەوەی کە لەدڵ و دەروونتاندا هەیە، خۆ ئەگەر چاک و پاک و ڕێکو پێک بن، ئەوە بەڕاستی ئیتر ئەو زاتە بۆ تەوبەکاران و پەشیمانان زۆر لێخۆشبوو بەخشندەیە.

- وَءَاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا (الإسراء: ٢٦) مافی خزم و خوێشان بەجێ بهێنە و پەیوەندیەکان (لە چوار چێوەی شەرعدا چاودێری بکە) هەروەها مافی هەژارانیش (بە یارمەتیدانیان بە گوێرەی توانا) ئەنجام بدە هەروەها مافی ڕێبواریش (بەدەستگیرۆیی و ڕێ نیشاندان) جێبەجێ بکە، دەست بڵاویش مەبەو ماڵ و سامانت بەفیرۆ مەدە.

- إِنَّ ٱلْمُبَذِّرِينَ كَانُوٓاْ إِخْوَٰنَ ٱلشَّيَٰطِينِ وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورًا (الإسراء: ٢٧) بەڕاستی زیادە ڕەوان دۆست و برای شەیتانەکانن، شەیتانیش بەرانبەر (نازو نیعمەتەکانی) پەروەردگاری هەمیشە سپڵەیە.

- وَإِمَّا تُعْرِضَنَّ عَنْهُمُ ٱبْتِغَآءَ رَحْمَةٍ مِّن رَّبِّكَ تَرْجُوهَا فَقُل لَّهُمْ قَوْلًا مَّيْسُورًا (الإسراء: ٢٨) خۆ ئەگەر نەتتوانی یارمەتی ناوبراوان بدەیت و بەئومێدی ڕەحمەتی پەروەردگارو بەخششی ئەو بوویت ئەوە دەکرێت بە گوفتاری جوان و قسەی خۆش ڕازییان بکەیت.

- وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ ٱلْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا (الإسراء: ٢٩) وە دەستت مەکە کۆت بەگەردنتاندا و کراوە و بەڕەڵاشی مەکە بەتەواوی تا نەبیتە کەسێکی لۆمەکراوی هیچ بەدەستەوە نەماو.

- إِنَّ رَبَّكَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا (الإسراء: ٣٠) بەڕاستی پەروەردگارت بە هەر کەس کە بیەوێت ڕزق و ڕۆزی فراوان دەبەخشێت، یاخود کەم و سنوورداری دەکات، بێگومان ئەو زاتە ئاگادارو بینایە بەبەندەکانی، (بەخشین و نەبەخشینی هەڕەمەکی نیە).

- وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَٰقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْـًٔا كَبِيرًا (الإسراء: ٣١) وە ڕۆڵەکانتان مەکوژن لەترسی هەژاری و بێ نەوایی ئێمە ڕۆزی ئەوانیش و ئێوەش دەدەین بەڕاستی کوشتنی ئەوانە هەڵە و تاوانێکی گەورەیە.

- وَلَا تَقْرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا (الإسراء: ٣٢) هەرگیز نەکەن توخنی زینا بکەون و لێی نزیک ببنەوە، چونکە ئەوە بەڕاستی گوناهو تاوان و هەڵە و ڕێچکەیەکی زۆر ناقۆڵایە.

- ﴿وَلَا تَقْتُلُواْ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَٰنًا فَلَا يُسْرِف فِّي ٱلْقَتْلِ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا﴾ (الإسراء: ٣٣) وە کەسێک مەکوژن کە خوا کوشتنی ئەوی حەرام کردووە مەگەر بە (هۆیەکی) ڕاست و ڕەوا جا هەر کەسێک بەناهەق و ستەم لێ کراوی کوژرا ئەوە دەسەڵاتمان داوە بە خاوەنەکەی (بەسەر بکوژەکەدا) جا با خاوەنەکەی زیادەڕۆیی نەکات لە تۆڵە سەندندا چونکە بەڕاستی ئەو (خاوەنە) یارمەتی دراوە.

- ﴿وَلَا تَقْرَبُواْ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ وَأَوْفُواْ بِٱلْعَهْدِ إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولًا﴾ (الإسراء: ٣٤) وە نزیکی ماڵی هەتیو مەکەونەوە مەگەر بەچاکترین شێوە (کە بریتی یە لە پاراستن و بەرهەم هێنانی) هەتا (هەتیوەکە) دەگاتە کەماڵی ژیری و لێزانی وەفا بکەن بە بەڵێن و پەیمانەکانتان بەڕاستی (خاوەن) بەڵێن و پەیمان پرسیار لێ کراوە.

- ﴿وَأَوْفُواْ ٱلْكَيْلَ إِذَا كِلْتُمْ وَزِنُواْ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا﴾ (الإسراء: ٣٥) هەر کاتێک کێشان و پێوانتان ئەنجامدا بەڕێک و پێکی و تێرو تەواوی ئەنجامی بدەن، ئەو شێوەیە چاکترەو جوانترین ئەنجامی هەیە (لە دنیادا ئاسوودە دەبن و پاداشتی قیامەتیش بەدەست دەهێنن).

- ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا﴾ (الإسراء: ٣٦) وە شوێن شتێ مەکەوە کە زانیاریت دەربارەی نی یە بەڕاستی گوێ و چاو و دڵ هەموو ئەوانە (خاوەنیان) پرسیار لێکراوە.

- ﴿كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكْرُوهًا﴾ (الإسراء: ٣٨) هەموو ئەو شتانەی کە لە ئایەتەکانی پێشوودا باسمان کرد، خراپەکانی لای پەروەردگارت ناپەسەندو نابەجێیە (هەوڵ بدە هەمیشە دوورە پەرێزبیت لێیان).

- ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوْحَىٰٓ إِلَيْكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلْحِكْمَةِ وَلَا تَجْعَلْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتُلْقَىٰ فِى جَهَنَّمَ مَلُومًا مَّدْحُورًا (الإسراء: ٣٩) ئەمانەش بەشێکن لەو کارزانیيانە، کە پەروەرندەت بە تۆی ڕاگەیاندووە. وێڕای خودا پەرستووی تر مەپەرستە؛ کە ئەوسا بە لۆمەکراوی و ڕاونراوی تووڕ ئەدرێیتە دوڕ جەهەندەم.

دیارە ڕەوشتەکان لە قورئانی پیرۆزدا زۆر فراوانن ناکرێ لێرەدا باسی بکەین، بەڵام بە پشتیوانی پەروەردگار لەم مەوسووعەدا بەرگێک بۆ ڕەوشتەکان تەرخاندەکەین بە تایبەت ڕەوشتی خێزانی.

## لەمپەری نۆیەم: لە مپەری خوێندن

گومان لەوەدا نییە کە خوێندن و خوێندەواری کارێکی باش و گرنگە، بەڵکو لەمڕۆدا پێویستە بۆ هەردوو ڕەگەز کە خوێندەواربن چونکە شێوازی ژیانی ئەمڕۆ ئەوە دەخوازێ، وە خوای گەورە لە یەکەم ئایەتا فەرمانمان پێدەکا

- بە خوێندنەوەو فێربوون: ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ (العلق: ١) ئەی محمد صلی الله علیه وسلم) بخوێنە بەناوی ئەو پەروەردگارەتەوە کە هەموو شتێکی دروست کردووە.

- یەکێک لە کارە سەرەکیەکانی پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام خوێندنەوەو فێرکردنە: هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ (الجمعة: ٢) خوا ئەو زاتەیە کە ناردوویەتی لە ناو نەخوێندەواراندا (عەرەبەکاندا) پێغەمبەرێک لە خۆیان دەخوێنێتەوە بە سەریاندا نیشانەکانی خوا پاکیان دەکاتەوە وە قورئان و فەرموودەی (پڕ سوود) یان فێر دەکات هەرچەند ئەوان لە مەوپێش لە گومڕایەکی ئاشکرادا بوون.

- وە هەتا سەگێکی فێرە ڕاو نێچیرەکەی دەخورێ لە بەر ئەوەی کە فێرکراوە بەڵام ئەگەر فێرە ڕاو نەبێ نێچیرەکەی ناخورێ: يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمْ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ وَمَا عَلَّمْتُم مِّنَ ٱلْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ ٱللَّهُ فَكُلُوا۟ مِمَّآ أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ وَٱذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ (المائدة: ٤). ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) پرسیارت لێدەکەن چی حەڵاڵکراوە بۆیان؟ پێیان بڵێ: هەرچی خۆراکی چاک و پاکە بۆتان حەڵاڵ کراوە، ئەوەش باڵندەو تانجی شکاری بۆتان ڕاو دەکەن و فێرتان کردوون (بێگومان خوا توانای بەخشیووە بە مرۆڤ بتوانێت مەشق بکات بەگیانداران و فێریان بکات ڕاوی بۆ بکەن بەتایبەتی تانجی)، دە بخۆن لەوەی بۆتان دەگرن و ناوی خوای لێ بهێنن کاتێک بەڕەڵای دەکەن و کاتێک لێی دەخۆن، هەر لە خوایش بترسن و پارێزکاربن (ئەی ڕاوچیەکان)، بەڕاستی خوا بەخێرایی لێپرسینەوە ئەنجام دەدات (ووردو درشتی کردارو ڕەفتار فەرامۆش ناکات).

- ئیمانداران هەموو خاوەنی ڕێزن بەڵام لە ناو بڕواداراندا زانایان پلەیان بەرزترە: يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا قِيلَ لَكُمْ تَفَسَّحُوا۟ فِى ٱلْمَجَٰلِسِ فَٱفْسَحُوا۟ يَفْسَحِ ٱللَّهُ لَكُمْ وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُوا۟ فَٱنشُزُوا۟ يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ (المجادلة: ١١). ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە کاتێک لە دانیشتن و کۆبونەوەکاندا پێتان دەوترێت: ڕێ بدەن بەکەسانی ترو ئەڵقەی دانیشتنەکە فراوان بکەن، ئەوە ئێوەش فراوانی بکەن، ئەگەر ئێوە واتان کرد خوا پاداشتی فراوانتان پێ دەبەخشێت، کاتێکیش پێتان دەوترێت هەستن و جێگە چۆڵ بکەن، (بۆ پیاوماقووڵ و ڕیش سپی و گەورەکانتان) جێگە چۆڵ بکەن، جا ئەگەر واتان کرد خوای گەورە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە لە ئێوە و ئەوانەشتان زانست و زانیاریان پێدراوە چەندەها پلەو پایە بەرزیان دەکاتەوە، خوایش ئاگایە بەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

- هەرچی پێشکەوتن لە دونیادا دەیبینین هەمووی بەرهەمی زانستە، زانایان میراتگری پێغەمبەرانن: ( صحيح البخاري - كِتَابٌ : الْعِلْمُ - بَابٌ : الْعِلْمُ قَبْلَ الْقَوْلِ وَالْعَمَلِ.[17]

- بَابٌ : الْعِلْمُ قَبْلَ الْقَوْلِ وَالْعَمَلِ لِقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى : { فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ

- }. فَبَدَأَ بِالْعِلْمِ، وَأَنَّ الْعُلَمَاءَ هُمْ وَرَثَةُ الْأَنْبِيَاءِ، وَرَّثُوا الْعِلْمَ مَنْ أَخَذَهُ أَخَذَ بِحَظٍّ وَافِرٍ.

- وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَطْلُبُ بِهِ عِلْمًا سَهَّلَ اللَّهُ لَهُ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ.[18]

وَقَالَ جَلَّ ذِكْرُهُ :

- { إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ }

- وَقَالَ : { وَمَا يَعْقِلُهَا إِلَّا الْعَالِمُونَ }.

- { وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ }

- وَقَالَ : { هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ }.

- وَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَهِّمْهُ، وَإِنَّمَا الْعِلْمُ بِالتَّعَلُّمِ

- وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ : كُونُوا رَبَّانِيِّينَ حُلَمَاءَ فُقَهَاءَ،

- وَيُقَالُ : الرَّبَّانِيُّ الَّذِي يُرَبِّي النَّاسَ بِصِغَارِ الْعِلْمِ قَبْلَ كِبَارِهِ

ئیمامی بوخاری ڕەحمەتی خوای لێبێ لە كتاب العلم لە کتابەکەیدا ئەم هەموو بەڵگانەی هێناونەوە

---

[17] صحيح البخاري

[18] ـ سنن ابن ماجه ٢٢٣،

کەواتە ئێستا بە بەڵگەی قورئان و فەرموودەو واقعی ئەمڕۆی کۆمەڵگا هیچ گومانمان لە سەر گرنگی و پێویستی زانست فێربوون و فێرکردن نییە، بەڵام گرفتەکەی ئێمە ئەوەیە تا چەند دەکرێ خوێندن و دراسە ببێتە بەربەستی هاوسەرگیری.

- ئێمە ناڵێین خراپە کورێک یان کچێک لە خۆیڕا ببینێ توشی تاوان نابێ دوای تەواو بوونی خوێندن هاوسەر گیری بکا، لێرەدا بڕیارەکە  دەگەڕێتەوە بۆ خودی کوورِو کچەکە

- باشە ئەگەر کوڕ  یان کچ ئەگەر زانی تووشی خراپەو تاواندەبێ ئایا هاوسەرگیری بکاو هاوکات دراسەکەی بکات باشتر نییە؟ بێگومان بەڵێ، سەرکەوتوو تر دەبێ و تووشی تاوان و قەلەق و دوودڵیش نابێ.

- دەتوانێ سەرەتا لە گەڵ ئەوکەسەدا ڕێکبکەوێ کە هاوسەرگیری لە گەڵدا دەکا، کە ئەو دەیەوێ خوێندنەکەی تەواو بکا، ئەو کات پێویستە ئەم کوڕە پابەندبێ بە بەڵێنەکەیەوە.

- سوودی ئەم هاوسەرگیرییە ئەوەیە کە زوو لە تاوان و کاری خراپ دوور دەکەونەوە.

- زووتر دەتوانن دابمەزرێن و  کاری گونجاو بۆ خۆیان بدۆزنەوە.

- دەرفەتی جوانی و هەرەتی لاوی لە دەست نادەن.

- لەوانەیە دەرفەتی زێرینی بۆ ڕێک بکەوێ کە ئەوە لەوانەیە کەم دووبارە بێتەوە.

- دوور دەکەوێتەوە لە کێشەی قەیرە بوون، یاخود نزیکبوون لە قەیرەبوون.

- دەرفەتی مناڵبوونی لە دەستناچێ، چونکە ئافرەتان کە تەمەنیان بالاْبوو کێشەی منالْ نەبوونیشیان بۆ دێتە پێش.

- لەوانەشە کۆمەڵێک سەلبیات و نەریتی هەبێ لەو هاوسەرگیریەدا. بە تایبەت لایەنی مادی، شوێنی نیشتەجێبوون، ئیش و کار، کەم تەجروبەیی.

- لێرەدا مەرج نییە هەموو کات خوێندن ڕێگربێ لە هاوسەرگیری. زۆر کوڕ هەیە بواری دارایی باشە، یان ماڵی باوکی هاوکاری دەکەن و پشتیوانی دەکەن، یان هاوکات لە گەڵ خوێندن کارێکی باشی هەیە.

- دەبێ ئەوەش بڵێین کە کوران و کچان لە وەختی گونجاوی هاوسەرگیری دواکەوتن تووشی قەلەقی و دڵەڕاوکێ دەبن لە بڕیارپڕداندا سەبارەت بە هاوسەرگیری.

- دەبێ بزانین کۆمەڵگەی ئێمە کۆمەڵگەی ئەورووپی نییە کە کوڕو کچ ئازادن چیدەکەن لە خراپەو تاوان هیچ ڕێگریەکی دین و نەریتی و یاسایی لە بەردەمیاندا نییە، چونکە کە دەچن بۆ زانکۆ، یان پەیمانگا ئەوان لە تەمەنی یاسایی خۆیاندان ئازادن چۆن وەڵامی حەزە سێکسیەکانیان دەدەنەوە، بەڵام ئایا بۆ مسوڵمان ئەوە. ڕەوایە!؟

- دەبێ ئەوەش بڵێین کە بەشێک لە فێمینستەکان زۆر بە ئامانجەوە دەیانەوێ پرۆسەی هاوسەرگیری شکست بێنێ بۆیە دەڵێن نابێ کچ زوو شوو بکا. یان نابێ بۆ هاوسەرگیری واز لە خوێندن بێنێ. یان لە کاتی خوێندندا هاوسەرگیری بکات، یان دەبێ کچ ئابوری سەربەخۆی هەبێ، کۆمەڵێک بیانوی تریش هەن کە لە وانەیە کەمێک ڕاستیان تێدا بێ، بەڵام تەواوی ڕاستییەکان نین ، یان لەوانەیە بۆ چونەکانی تر ڕاسترو واقعیترو شەرعیترین.

- ئەوەی گرنگە ئێمە ئەو بەربەست و کۆسپە لابەرین لە بەردەماندا، ئەگەر هەر کات دەرفەتی باش ڕەخسا لە بەردەمی کوڕو کچدا بە بە شانازییەوە هاوسەرگیری بکەن، وە نابێ بە چاوی کەم تەماشا بکرێن کە گوایە ئەوانە ئاستی ڕۆشنبیریان تەواو نییە، یان پەلەیان کردوە یان...

## لەمپەری دەیەم: جیاوازی ئاستی مادی لە نێوان داخوازیکارو داخوازیکراو

خوای گەورە مرۆڤەکانی جیاواز دروستکردوون لە مستەوای تێگەیشتن و توانای کارکردن و بیرکردنەوەو هێزو توانا، ڕاستە بەهرەو توانای بە هەموویان بەخشیووە، بەڵام ناتوانن هەموویان لە بەهرەکانیان سوودمەندبن، خەڵکانێک هەن بەڵکو زۆربەی خەڵک پێویستی بە فێرکردن و ڕێنماییکردن و خستنە سەرکارە، وە دەبێ بەهرەکانی نیشان بدرێ با لەو کەسەشدا بەهرەکان هەبن، بەڵام لەوانەیە ئەو کەسە خۆی نەیزانی، جا یەکێک لەو بوارانە بواری دەوڵەمەندی و کەسابەت و کارە، وە دەوڵەمەندی و هەژارییە، هەرچەند ئەمە لە وەڵاتێکەوە بۆ وەڵاتێک دەگۆڕێ بۆ نموونە: کەسێک لە ئەفەریقا بژی دەخل و داهاتی لاوازە تاوەکو ئەوکەسەی لە ئوستراليا، یان لە سویسرا دەژی، کەسێک لە وەڵاتێکی گەندەڵی وەک عێراقدا بژی جیاوازە لەو کەسەی کە لە کەنەدا یان سەنغافورەدا بژی، کەسێک لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەندو خاوەن داهات و کۆمپانیادا بژی جیاوازە لەوەی کە باوکودایکی کرێکارێکی سادەن و تەنیا بە زەحمەت بژێوی خۆیان پەیدا دەکەن، کەسێک کە ستەم لێکراو و هەژارەو باج و سەرانەی زۆرە جیاوازە لەوەی کە بە پێچەوانەوەیە.

ئەوەی کە مەبەست و گرنگە بەلامەوە ئەوەیە ئایا تا چەند دەکرێ جیاوازی ئاستی دارایی کوڕو کچ ببێتە گرفت و کۆسپ لە بەردەم هاوسەرگیری؟

- وەک وتمان شتێکی ئاساییە جیاوازی ئاستی ژیان و ئابووری ئەم دوو کەسە، چونکە ئەوە تەنیا ئەم دوو کەسە وانین، بەڵکو دونیا لەم جۆرانەی بە سەدان ملیۆن تێدا.

- زیاتر ئەوکاتە دەبێتە گرفت کە کچەکە ئاستی بژێوی بەرزتر بێ لە کوڕەکە، چونکە وا گوماندەکرێ کە ئەوکاتە کچەکە بەم ژیانە ڕازی نەبێ و گرفت و

کێشە دروستبێ، بەڵام مرۆڤی ژیر دەبێ ئەمە بکاتە بەهرەو نیعمەتێکی گەورە بەوەی کە کچەکە هاوکاری هاوسەرەکەی بکاو یارمەتی بدات و دەستگیرۆی بکات و لەگەڵیدا قورسایی و ئەرکی ژیان هەڵبگرێ، بۆیە با ئەمە هۆکاری خۆشەویستبونی ژنەکە بێ لای پیاوەکە نەوەک هۆکاری تێکچوونی ژیان.

- وە ئەگەر کوڕەکە ئاستی ئابوری لە بنەماڵەی کچەکە باشتربوو دەبێ بزانێ کە ئەمە نیعمەتێکی گەلێک گەورەیە چونکە ماڵی خەزورەکانی گومانی لێناکەن لە خۆشکردنی ژیانی کچەکەیان، وە متمانەیان پێدەبێ و وە لە جێگەو ڕێگەی کچەکەیان دڵنیا دەبن، وە نابێ پیاو بە هیچ شێوەیەک لەسەر ئەم بابەتە منەت بەسەر خێزان و ماڵە خەزورانیدا  بکا، چونکە منەتکردن تاوانێکی گەورەیە، وە فیزو خۆ بەگەورە نواندن لەو گەورەترە، وە ئەو کوڕە دەتوانی دڵی هاوسەرەکەی بەوە خۆشبکا کە بتوانی یارمەتی کەس و کاری ئەویش بدا، لە نەتیجەدا ئەگەر بە دینداری و بە ژیری ڕەفتار کەین بۆمان دەردەکەوێ کە جیاوازی ئاستی ئابوری نەک ژیان تێک دەدا بەڵکو هەر زۆریش خۆشی دەکات.

- گرفتێکی دیکە ئەوەیە کە بڵێین بۆ نموونە کچەکە لەماڵێکی ڕەفاهی و خۆشگوزەران گەورە بووە چۆن دەتوانێ لە گەڵ ژیانی ئەم هاوسەرە خۆی ڕابێنێ؟ بێگوومان ئەوە ئاسانە:

یەکەم: بڕیاری بوێرانەو متمانە بەخۆبوون.

دووەم: بە یارمەتیدانی هاوسەرەکەی.

سێیەم، بەوەی کە بزانێ ماڵی دونیا چڵکی دەستا بۆ کەس تا سەرو مسۆگەر نییە، لەوانەیە ئەم هاوسەرە هەژارو دەست کورتە بتوانی جێگای لە لە گەڵ باوانی ئەو بگۆڕێتەوە لە بارەیی ئاستی ڕەفاهی و ئابوریەوە، جا بۆیە نابێ

جیاوازی ئاستی ژیانی كەس و كاری هاوسەران ببێتە كۆسپ لە بەردەم هاوسەرگیریدا.

- دەشكرێ بلێین با ئەو بابەتە بە ئاسایی وەربگرین ئەگەر لە خۆمان ڕانابینین لە گەڵ ئەم جۆرە ژیانەدا هەڵكەین با بڕیاری هاوسەرگیری لە سەرەتاوە نەدەین، نەوەك دواتر تێكی بدەین.

## لەمپەری یازدەم: دەستی پیس و خیانەت

یەكێك لە لەمپەرەكان لە بەردەم پرۆسەی هاوسەرگیری خیانەت و درۆ هەڵبەستن و پێدانی زانیاری ناڕاست و بوهتان كردنە كە دەتوانین بڵێین ئەگەر كەسێك پرسی پێكراو و بەدرۆ وەڵامی دایەوە لەسەر كەسی پرسیار لەسەركراو جا كوڕەكە بێ یان كچەكە چەندین تاوان لە خۆ دەگرێت:

١. دەبێ مرۆڤ ڕاستگۆ بێ و دووربێ لە درۆ، بە تایبەت لە سەر زانیاری لەسەر كەسێك بۆ بابەتێكی ئەوا گرنگ خوای گەورە دەفەرموێ: أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ نَتَقَبَّلُ عَنْهُمْ أَحْسَنَ مَا عَمِلُواْ وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّـَٔاتِهِمْ فِيٓ أَصْحَـٰبِ ٱلْجَنَّةِ وَعْدَ ٱلصِّدْقِ ٱلَّذِى كَانُواْ يُوعَدُونَ (الأحقاف: ١٦) واتە: ئەوانە كەسانێكن كە ئێمە كردەوە چاكەكانیان لێ وەردەگرین وە چاوپۆشی دەكەین لە خراپەكانیان لە ڕیزی بەهەشتیاندان ئەمە ئەو بەڵێنە ڕاستەیە كە بەڵێنیان پێ درابوو لە دنیادا.

كەواتە بەڵێنی ڕاست و دوا ڕۆژی ڕۆشن بۆكەسانێكە كە خاوەنی ڕەوشت و ئاكاری بەرزن كە ڕاستی و ڕاستگۆیی لە هەموو سیفەتەكان گرنگترە لە دوای ئیمان.

لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَـٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَـٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَـٰهَدُواْ

وَٱلصَّٰبِرِينَ فِي ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ (البقرة: ١٧٧) واتە: چاکە ئەوە نی یە کەڕوو بکەنە بەرەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بەڵکو چاکە ئەوەیە کە مرۆڤ بڕوای ببێ بەخوا و ڕۆژی دوایی و فریشتەکان و کتێبەکان و پێغەمبەران و دارایی خۆی ببەخشێ لەگەڵ ئەوەی کەخۆشی دەوێت بەخزمان و هەتیوان و بێ نەوایان (هەژاران) و ڕێبواران و سواڵکەران و لەڕێ ی ئازاد کردنی کۆیلەکاندا وە نوێژی بەچاکی کردبێت و زەکاتی دابێت و پەیمان بەجێ هێنەران کاتێک کەپەیمانیان دابێت و خۆڕاگران لەکاتی تەنگدەستی وە نەخۆشی و لەکاتی جەنگدا ئا ئەوانەن کەڕاستیان کرد وە هەرئەوانەن پارێزکاران.

لەم ئایەتە پیرۆز دەردەکەوێ کە تا مرۆڤ خاوەنی ئیمان و کۆمەڵێک بەهای ئەخلاقی نەبێ نابێتە شایەنی ئەوە کە بە ڕاست وەسف بکرێ گەورە راستە لە وەی کە دیفەرموی و لەو بەڵێنانەی کە دەیدا.

وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥٓ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِۦ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَٰزَعْتُمْ فِي ٱلْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ (آل عمران: ١٥٢)

واتە: سوێندبێ بێگومان خوا بەجێ هێنا بۆتان بەڵێنەکەی کاتێک(سەرەتای جەنگی ئوحود) هەستتان لێ بڕین(دەتان کوشتن) بە فەرمانی خوا هەتا کاتێ(لە ناکاو) سست بوون ئاژاوە و دووبەرەکیتان کرد لەکاری جەنگدا وەبێ فەرمانیتان کرد لە پاش ئەوەی کە خوا نیشانی دان ئەوەی(لە جەنگەکەدا) پێتان خۆش بوو(کە سەرکەوتن لە سەرەتای جەنگەکەدا) هەندێک لە ئێوە (دەسکەوتی) دنیایی دەویست وە هەندێکتان پاداشتی ڕۆژی دوایی دەویست پاشان(خوا) ئێوەی گێڕایەوە لە (جەنگی) ئەوان(و تێ شکان) تا تاقیتان

بکاتەوە (لە خۆڕاگرتندا) سوێند بێ بێگومان خوا لێتان بوورا وە خوا خاوەنی بەهرە و چاکەیە بەسەر بڕوادارانەوە.

خوای گەورە بەڵێنی سەرکەوتنی لە گەڵ هاوەڵان گەیاندە سەر هەتا ئەو کاتەی ئەوان پابەند بوون.

قَالُواْ نُرِيدُ أَن نَّأْكُلَ مِنْهَا وَتَطْمَئِنَّ قُلُوبُنَا وَنَعْلَمَ أَن قَدْ صَدَقْتَنَا وَنَكُونَ عَلَيْهَا مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ (المائدة: ١١٣) واتە: حەواریەکان وتیان دەمانەوێ لێ ی بخۆین و دڵمان ئارام بێ و دڵنیا بین (کە پێغەمبەریت) وە بزانین کە بێگومان ڕاستت لەگەڵ کردوین (لەوەی کە پێت ڕاگەیاندین) ئێمەش ببین بە شایەت لەسەری بۆ ئەوانەی ئامادە نین.عیسا بە عیسایان وت سگرەیەکمان بۆ دابەزێنە لە ئاسمان، یەکێک لە ئامانجەکانیان ئەوەبوو ڕاستی موعجیزەکانی عیسایان بۆ دەربکەوێ و لای خەڵک باسی بکەن.

قَالَ ٱللَّهُ هَٰذَا يَوْمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدْقُهُمْ لَهُمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ (المائدة: ١١٩) واتە: خوای گەورە فەرمووی : ئەمە ڕۆژێکە ڕاست بێژان ڕاستی یەکەیان کەڵکیان پێ دەگەیەنێ بەهەشتانێکیان بۆ هەیە کە ڕووبارەکان بە ژێریاندا دەڕۆن ئەمێننەوە تیایدا بە هەمیشەیی خوا ڕازی بووە لێیان و ئەوانیش لە خوا ڕازی بوون ئەوەیە سەرکەوتنی زۆر گەورە. دوا ڕۆژدا ئەوانەی ئەهلی ڕاستی و ڕاستگۆیین بەهرەمەند دەبن لە بەرهەمی ڕاستیەکەیان.

وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ ۚ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿١١٥ الأنعام ) واتە: ئەی موحەمەد وتەی پەروەردگارت لەو پەری تەواویدا لە ڕووی ڕاستی و دادگەریەوە.

عَفَا اللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَتَعْلَمَ الْكَاذِبِينَ ﴿٤٣ التوبة﴾

واتە: خوای گەورە بە میهرەبانیەوو گازندە لە پێغەمبەردەکا کە بۆچی بیانووی دوو ڕووەکانت قەبووڵکرد هەتا بۆت ڕووندەبۆوە کێن ئەوانەی ڕاستن و کێن ئەوانەی درۆزنن.

قَالَ هِيَ رَاوَدَتْنِي عَن نَّفْسِي ۚ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنْ أَهْلِهَا إِن كَانَ قَمِيصُهُ قُدَّ مِن قُبُلٍ فَصَدَقَتْ وَهُوَ مِنَ الْكَاذِبِينَ ﴿٢٦ يوسف﴾ واتە: لە ڕێی شاهیدو بەڵگەوە دەرکەوت کە یوسف ڕاستە و دەستدرێژی نەکردۆتە سەر خێزانی عەزیزی میسر، ئەگەر ڕاست نەبوایە ڕزگاری نەدەبوو

وَوَهَبْنَا لَهُم مِّن رَّحْمَتِنَا وَجَعَلْنَا لَهُمْ لِسَانَ صِدْقٍ عَلِيًّا ﴿٥٠ مريم﴾

واتە: خوای گەورە کە باسی ئیسحاق و یەعقوب دەکا سەلامی خوایان لێبێ دەفەرموێ لە ڕەحمەت و میهرەبانی تایبەتی خۆمان بەوانمان بەخشیبوو، وە زمانێکی ڕاست و بەرزمان پێدابوون.

ثُمَّ صَدَقْنَاهُمُ الْوَعْدَ فَأَنجَيْنَاهُمْ وَمَن نَّشَاءُ وَأَهْلَكْنَا الْمُسْرِفِينَ ﴿٩ الأنبياء﴾

واتە: خوای گەورە باس لەوە دەکا کە ئەو بەڵێنانەی بە پێغەمبەرانی دابوو هەمووی بۆ وەدیهێنان.

• وَاجْعَل لِّي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الْآخِرِينَ ﴿٨٤ الشعراء﴾ ئیبراهیم سەلامی خوای لەسەربێ دەفەرموێ: ئەی پەروەردگارم با لە دوای خۆم بە چاکەو ڕاستی باسم بکرێ.

• قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ الْكَاذِبِينَ ﴿٢٧ النمل﴾ سولەیمان بە پەپولەکەی وت تەماشا دەکەین بزانین ڕاستدەکەی یان لە درۆزنانی، کەواتە درۆ لە زیندەوەرانیش قەبوڵکراو نییە.

• وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ ﴿٣ العنكبوت) گەورە خەڵک تاقیدەکاتەوە تا دەرکەوێ کێن ئەوانەی دوو ڕوون، وە کێن ئەوانەی درۆدەکەن

• مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلًا ﴿٢٣ الأحزاب﴾لەناو بڕواداراندا هەڵکەوتوانێک هەن کە راستبوون لە گەڵ خوادا لەو بەڵێنەی کە بە خوای گەورەیان دابوو.

• وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُ فَاتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقًا مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٠ سبإ﴾ شەیتان کە بەڵێنی دابوو زۆربەی خەڵک گومرا بکا ئەو بەڵێنەی گەیاندە سەر تەنها بڕواداران نەبن.

ئەم ئایەتە پیرۆزانە هەمووی باسی ڕاستی و ڕاستگۆییە، جا خوای گەورە باسی ڕاستی بەڵێنەکانی خۆیی و پەیامەکانی و دینەکەیی دەکات، وە باسی ڕاستی پێغەمبەران و بڕواداران دەکات. لەبەرامبەردا خوای گەورە زەمی درۆ و ناڕاستی کردووە کە بەڵگەکان زۆرن.

٢. دەبێتە خیانەت و نائەمینی، چونکە مرۆڤ نابێ لە بابەتی ئەوا گرنگدا نائەمینی و خیانەت بکات:

• ذَٰلِكَ لِيَعْلَمَ أَنِّي لَمْ أَخُنْهُ بِالْغَيْبِ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي كَيْدَ الْخَائِنِينَ ﴿٥٢ يوسف﴾ خێزانی عەزیزی میسر لەدوای ئەوەی دانی نا بە تاوانەکەی وتی بۆ ئەوەی بزانێ کە من لە نائامادەیی ئەو من خیانەتی پێناکەم.

• إِنَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللَّهُ ۚ وَلَا تَكُن لِّلْخَائِنِينَ خَصِيمًا ﴿١٠٥ النساء ﴾

• وَلَا تُجَادِلْ عَنِ الَّذِينَ يَخْتَانُونَ أَنفُسَهُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا ﴿١٠٧ النساء﴾ **خوای گەورە دەفەرموێ: ئەی موحەمەد بەرگری لە خائینان مەکە، چونکە خوای گەورە ئەوانەی خۆشناوێن کە خائین و تاوانبارن.**

• فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَاقَهُمْ لَعَنَّاهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَاسِيَةً ۖ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِ ۙ وَنَسُوا حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا بِهِ ۚ وَلَا تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَىٰ خَائِنَةٍ مِّنْهُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ۖ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاصْفَحْ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ﴿١٣ المائدة﴾ **خوای (گەورە زەمی جولەکەکان دەکا کە بەردەوام خیانەت و نائەمینیان لێڕوودەدا.**

• يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَخُونُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُوا أَمَانَاتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٧ الأنفال﴾ **ئەی ئەوانەی بڕوادارن خیانەت مەکەن بە خوا، بە پێغەمبەر، بە سپاردەکانتان، کە پرس پێکران بۆ بابەتی هاوسەر گیر ئەمانەتە دەبێ ڕاستبین.**

• وَإِن يُرِيدُوا خِيَانَتَكَ فَقَدْ خَانُوا اللَّهَ مِن قَبْلُ فَأَمْكَنَ مِنْهُمْ ۗ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٧١ الأنفال﴾ **ئەگەر (بەدیلگئراوەکان ویستیان خیانەتت لێبکەن و فریوت دەن ئەوە پێشتر** خوا[illegible] [illegible][illegible]ور[illegible] ت[illegible][illegible][illegible][illegible] ل[illegible] ئ[illegible]وان [illegible]رد[illegible]و[illegible]و ت[illegible][illegible] ب[illegible]س[illegible]ر ئ[illegible]واندا س[illegible]رخست.

• إِنَّ اللَّهَ يُدَافِعُ عَنِ الَّذِينَ آمَنُوا ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٍ كَفُورٍ ﴿٣٨ الحج

• يَعْلَمُ خَائِنَةَ الْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي الصُّدُورُ ﴿١٩ غافر﴾ **خوای (گەورە ئاگای لە خیانەتی چاوەو ئاگادارە بەوەی دڵەکان دەیشارنەوە.**

• ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا امْرَأَتَ نُوحٍ وَامْرَأَتَ لُوطٍ ۖ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَالِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ اللَّهِ شَيْئًا وَقِيلَ ادْخُلَا النَّارَ مَعَ الدَّاخِلِينَ ﴿١٠ التحريم﴾ **خێزانی (نوح و لوت کە خیانەتی ئیمانیان بە هاوسەرەکانیان کرد هیچ شتێک ئەوانی لەسزا ڕزگار نەکرد.**

٣. دەکاتە بوهتان، بەڵام بوهتانی تاوانبارکردن بە زینا نییە، بەڵکو تاوانبارکردنی کەسێکە بە ناراستی لە کاتێکدا دەبێ کەسی پرس پێکراو ئەمین و دەم و دڵپاکبێ: **سنن أبي داود - أَوَّلُ كِتَابِ الْأَدَبِ - بَابٌ : فِي الْمَشُورَةِ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " الْمُسْتَشَارُ مُؤْتَمَنٌ ".حكم الحديث: صحيح.**[١٩] واتە: کەسی پرس پێکراو ئەمینە، واتە دەبێ راست و ئەمین و جێگای متمانە بێ

٤.دەچێتە چوارچێوەی نەمیمی و قسەهێنان و بردن: **لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ نَمَّامٌ**[٢٠]

واتە ئەو کەسەی قسە دێنێت و دەبات بۆ ئاژاوە نانەوە ناچێتە بەهەشت، ئەگەر خوای گەورە رەحمی پێنەکا

٥. لە هەمووش خراپتر ئەوەیە  کە کەسەکە خۆی بە دۆست و نزیک و ئەمیندارو دڵسۆز نیشان بدا، کەواتە بانەبینە هۆکاری تێکدانی کاری خێرو بوونە لەمپەر لە بەردەم هاوسەرگیری.

[١٩] سنن اب٢داود، ٥١٢٨،
[٢٠] رواه مسلم،١٠٥

## لەمپەری دوازدەم: خراپی خوشک و برای ئافرەتەکە، یان داخوازیکارەکە

یەکێک لە کۆسپ و لەمپەرەکان لە بەردەم سەرنەگرتنی هاوسەرگیری ئەوەیە کە خوشکی کچەکە یان برای کچەکە یان باوک یان دایک لە هاوسەرگیریدا سەرکەوتوو نەبووە، ئەوکات کە پرسیار دەکرێ لە کەسوکاری کچەکە کاتێک داخوازیکار ڕاستیەکان دەزانێ لە هاوسەرگیرییەکە سڵدەکاتەوە. واتە ئەم کچە باجی کەسوکاری دەدات نەوەک خۆی، ئەمە بۆ کوڕەکەش هەر ڕاستە، ڕاستە هاوسەرگیری دەبێتە هۆکاری خزمایەتی و تێکەڵاوبوون، مرۆڤ بەوە سەربەرزە لە گەڵ کەسانێک خزمایەتی بکات، کە سەرکەوتوو و ڕێکوپێک بن، بەڵام دەبێ ئاگاداری ئەم ڕاستیانە بین:

- کەس تاوانی کەس هەڵناگرێ: مَّنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا (الإسراء: ١٥) واتە: هەر کەس ڕێنموونی وەرگرتبێ ئەوە بێگومان ڕێنمونیەکەی هەر (سوودی) بۆ خۆیەتی و هەرکەسیش گومڕا بووبێ ئەوە بێگومان (زیانەکەی) هەر لە دژی خۆیەتی وە هیچ کەسێکی گوناهکار گوناهی هیچ کەسێکی تر هەڵناگرێ ئێمە هەرگیز سزای (بەندەکان) نادەین هەتا پێغەمبەر نەنێرین بۆیان.

- بۆی هەیە ئەو کەسەی فەشەلی هێناوە لە هاوسەرگیری، یان خراپ بووە ئێستا تۆبەی کردبێت و گۆڕابێت.

- وە دامانناا ئەوان با واش بن دەکرێ هەرکەسوکاری خراپ بوو کەس خزمایەتی نەکات، مەحرۆم بکرێ لە هاوسەرگیری؟ بێگومان ناکرێ!

## لەمپەری سێزدەهەم: ئیش و کاری ئافرەت

ئەگەر بێت و کۆمەڵگا بە پێی شەرع بەڕێوەبچێت و کاری پێبکات، ئەوە ئافرەت تووشی کێشەی نەفەقە و دابینکردنی ژیان نابێ بۆ؟

١. ئافرەت بە هەموو شێوەیەک ژیانی کەفالە کراوە، چونکە ئەگەر کچ بێ باوک کەفالەی ژیانی دەکات.

٢. ئەگەر ژن بێ ئەوە هاوسەرەکەی ژیانی دابین دەکت و پێویستە ئەوە بکات.

٣. ئەگەر دایک بێ ئەوە پێویستە مناڵەکانی ژیانی دابین کەن.

٤. گەر کەس نەبوو دەبێ دەوڵەت کەفالەی بکات، وە پێویستیشە ئەوە بکات.

٥. ئافرەت مافی خۆیەتی کاری هەبێێت و موچەو ژیانی سەربەخۆی هەبێت

٦. ئافرەت بەشی هەیە لە ماڵ و میرات و وەسیەت و بەخشیش و...هتد.

٧. کەواتە ئەگەر هات و ئافرەت کاری هەبوو باشە، بەڵام ئەگەر نەیبوو نەبێتە گرفت لە بەردەم هاوسەرگیرییدا، چونکە پیاو دەبێ نیەت و هیمەتی ئەوەی هەبێ کە کە خێزانی خۆی بە خێو بکات بەسەربەرزی.

٨. نابێ ئافرەتیش کە هاوسەرگیریەکی باشی بۆ ڕێککەوێ بڵێ هاوسەرگیری ناکەم تا دانەمەزرێم یان کاری سەربەخۆم دەستنەکەوێ، چونکە وا دەبێ ئەمەی بۆ ڕێکناکەوێ ، لەولاشەوە دەرفەتی هاوسەرگیریشی لە دەستدەچێ یان زۆر دوا دەکەوێت.

٩. دیارە کچ بە بیانووی ئەوە خۆی لە هاوسەرگیری دوا دەخات بۆ ئەوەی خۆی لە هاوسەرەکەی بێ منەت بکات و بڵێ من داهاتی خۆمم هەیە، دیارە خراپ نییە کە داهاتی خۆی هەبێت، بەڵام با ئەوە نەبێتە لەمپەر لە بەردەم هاوسەرگیری، وە ئەگەر توانی دارایی سەربەخۆی هەبێ دیسان ئەوە نەبێتە

گرفت بۆ ژیان لە گەڵ هاوسەرەکەی، چونکە زۆرێک لە هاوسەران لە سەر چۆنیەتی بەکارهێنانی موچە لە ماڵەوە کێشەیان بۆ دروستدەبێ، بەڵام دەبێ پارە وەسیلە و هۆکاری بەختەوەری بێ نەوەک گرفت و کۆسپ لە ژیانی هاوسەراندا.

ئەمە بۆ پیاو زیاتر گرفتە، چونکە زۆربەی کوڕەکان لە بەر نەبوونی کار لە کەرتی گشتی یان تایبەتی پرۆسەی هاوسەرگیری جێبەجێناکەن. بۆیە واباشە کوڕەکانیش ئەم خاڵانە لە بەرچاو بگرن بەڵکو هەندێکیان پێویستن لەوانە:

١. ڕزق و ڕۆزی بە دەست خوایە و تەواو بابەتێکی غەیبە، بۆیە نابێ پێمان وابێ هۆکارەکانی ڕزق و ڕۆزی هەموو ماددین.

٢. دەکرێ بۆ کاتی نەبوونی کار کۆسپ بێ لەبەردەم هاوسەرگیری، بەڵام نەوەک بۆ یەکجاری، خوای گەورەش هەروامان پێدەفەرموێ: وَلْيَسْتَعْفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَٱلَّذِينَ يَبْتَغُونَ ٱلْكِتَـٰبَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَـٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا۟ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (النور: ٣٣).

واتە: وە دەبێ ئەوانەی کە تواناى (ئەرکی) ژن هێنانیان نیە پاکژ خۆیان ڕاگرن هەتا خوا بە بەهرە (و ڕۆزی) خۆی بێ نیازیان دەکات وە ئەوانەی داوای نوسراو دەکەن (بۆ کڕینەوەی خۆیان) لە بەندەو کەنیزەکەکانتان ئەوە نوسراویان لەگەڵدا بنوسن (بۆ کڕینەوەو ئازاد بوونی خۆیان) ئەگەر خێرتان لەواندا بەدی دەکرد (کە بریتی یە لە توانای دانی ئەو پارەی ئەبێ بیدات بە خاوەنەکەی بۆ ئازاد بوونی) وە لەو ماڵەی کە خوا بە ئێوەی داوە پێیان بدەن وە کەنیزەکەکانتان زۆر لێ مەکەن (ناچاریان مەکەن) لەسەر زینا کردن ئەگەر ئەیانویست داوێن پاک بن تا ماڵ و سامانی ژیانی دنیاتان دەست کەوێت جا

هەرکەس ناچاریان بکات (زۆریان لێ بکات) ئینجا بەڕاستی خوا دوا ئەو زۆر لێ کردنەیان لێبووردەی میهرەبانە (بەو کەنیزەکانە کە بە زۆر زینایان پێ کرا) وە.

( وَلْيَسْتَعْفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ) لەم ئایەتە پیرۆزە سێ ئامۆژگاری گرنگ فێردەبین:

یەک: دەبێ کوڕان و کچان تەواو خۆیان دوور و پاک ڕابگرن لە تاوان، هەتا خوای گەورە دەرفەتی هاوسەرگیریان بۆ دەڕەخسێنێت.

دوو: دەبێ ئەم چاوەڕوانییە کاتی بێت.

سێ: خوای گەورە بەڵێنی دەوڵەمەندبوونی پێداون.

٣. نابێ مرۆڤ دەستەوستان دانیشێ و بەدوای کارەوە نەبێ چونکە سونەتی ژیانە دەبێ مرۆڤ هەوڵبدا بۆ ژیان دەنا ئاسمان زێڕو زیو نابارێنێ وەک ئیمامی عومەر فەرمووی ڕەزای خوای لێبێ.

٤. وە جاری وایە بۆ کوڕەکە جۆری کارەکە دەبێتە کێشە، لەوانەیە کچەکە یان ماڵی خەزورانی بە هەموو کارێک ڕازی نەبن، بەڵام گرنگ ئەوەیە کارەکە لە زاتی خۆیدا خراپ نەبێ، کەسوکار بە نارەوا بیرو ڕاو قەناعەتی کچەکە نەگۆڕن.

خاڵی کۆتایی ئەم مەسەلەیەش پێمخۆشە ئەوە بڵێم: کە بەداخەوە چ کەرتی تایبەتی چ کەرتی گشتی ئەوەندە هەلی کارەی کە لە دەستدایە پشکی شێری دەدەن بە ئافرەت ئەم بابەتە دەبوو بە پێچەوانەوە بێ ، چونکە مووچەی ئافرەتان هاوسەرگیری زیاد ناکات بەڵکو کەمیدەکاتەوە، لەولاشەوە دەستی پیاوان دەبەستێ لە هاوسەرگیریکردن!!

## لەمپەری چواردەم: تێرکردنی ئارەزووەکان لە ڕێگای قەدەغەکراو

غەریزەی جوتبوون لە مرۆڤدا قوڵە، ئەمە نەوەک بۆ مرۆڤ بەڵکو بۆ زیندەوەرانیش هەر ڕاستە، هەموو زیندەوەران لەم ڕێگایەوە درێژە بە مانەوەی خۆیان دەدەن، بەڵام ئەو بابەتە لە ژیانی مرۆڤەکاندا ڕێسا و یاسای تەواوی بۆ دانراوەو تەواو ڕێکخراوە بە تایبەت لە دینە ئاسمانیەکان و تایبەتتر دینی پیرۆزی ئیسلام، بۆیە دەبێ بزانین چۆن ئەم غەریزەیە لە شوێنی خۆیدا بە کاردەهێنرێت؟

١. ئارەزووی سێکسی عەیب و نەنگ نییە، کە مرۆڤ هەیبێ، بەڵکو نەبوونی نیشانەی بوونی کێشەی تەندروستییە.

٢. ئیسلام نەهاتووە غەریزەکان لە مرۆڤدا کپکاتەوە، بەڵکو هاتووە وا لە مرۆڤ بکات ئەم غەریزانە لە جێگای خۆی بە کاری بێنێت.

٣. ئەم غەریزانە کە خوای گەورە لە مرۆڤدا دایناون تەنیا بۆ ئەوە نییە لە دونیادا بە دیبێن، کە بێگومان هەموو غەریزەکانی مرۆڤ بەدیناین، بەڵکو بۆ ئەوەیە تەواوی داخوازی و غەریزەکان لە قیامەتدا بۆ مرۆڤ بێنە دی وەک خوای گەورە دەفەرموێ: نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْـَٔاخِرَةِ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِيٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ (فصلت: ٣١)

واتە: ئێمە لەژیانی دنیا و لە ڕۆژی دواییدا دۆستی ئێوەین وە لەو (بەهەشتەدا) هەرچی حەزی لێ بکەی بۆتان ئامادەیە وە هەرچی داوا بکەن لەوێدا لە خزمەتتاندایە.

٤. ئێمە لە بەرگی یەکەمی ئەو مەوسوعەیەدا باسی ٤٥ ئامانجی گرنگی هاوسەرگیریمان کردووە، کەواتە بەدیهێنانی جێبەجێکردنی ئەم ئارەزووی سێکسییە تەواو ئامانجدارە نەوەک ڕەهاو بێ یاساو ڕێسا.

٥. لە شەریعەتی ئیسلام هاندانی زۆر هەیە بۆ هاوسەرگیری خوای گەورە بەڵێنی داوە کە هاوکاربێ بۆ ئەو کەسەی بە نیپەتی باش هاوسەر گیری دەکات.

٦. هەرکەس ببێتە ڕێگر بە بێ هۆکاری شەرعی لەبەردەم ئەم پرۆسەیە گوناهبار دەبێ، هەموو کۆمەڵگا بەرپرسە بۆ دابین کردنی ژیانی هاوسەری بۆ ئەوانەی کە بێ ژن و مێردن وەک دەفەرموێ: وَأَنكِحُواْ ٱلْأَيَٰمَىٰ مِنكُمْ وَٱلصَّٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ إِن يَكُونُواْ فُقَرَآءَ يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ (النور: ٣٢).

واتە: ژن مارە ببڕن بۆ پیاوانی بێ ژن و ژنانی بێ مێردیش بدەن بەشوو (مێرد) هەروەها ئەوانەی ئیمان دارو چاکن لە کۆیلەکان (ژنیان بۆ بێنن) و کەنیزەکەکان (یش بدەن بەشوو) ئەگەر ئەوان هەژارو کەم دەست بن خوا لە بەخشندەی و بەهرەی خۆی دەوڵەمەندو بێ نیازیان دەکات وە خوا (بەهرە) فراوان و زانا و دانایە.

٧. گومان لەوەدا نییە کە لەمرۆدا هۆکارەکانی خەراپە و پشتکردن لە هاوسەرگیری یەکجار زۆربوون کە وەک نموونە هەندێکیان لێ باسدەکەین:

- لە وڵاتانی خەلیجی و یەمەن ڕێژەی قەیرەیی گەیوەتە ٣٥/١٠٠.
- لە ئەردەن ڕێژەی قەیرەیی ٥/١٠٠، ئەو ژمارەیە لە لوبنان زۆر لەوە زیاترە.
- لە فەلەستین لە ١/١٠٠.
- لە سوریا ژمارەی قەیرەکان دەگاتە ٧٠٠ هەزار زیاتر.
- لە عێراق زۆر لەوە زیاترە.
- لە میسر نزیکەی ٧ ملیۆنە.

ـ لە سودان و سۆمال ۲۰/۱۰۰.

لە جەزائیرو مەغریب زۆر لەوەزیاترە ئەم داتایانە هی ساڵێ تا ۲۰۰٤ چوارە کە لەراستیدا قەیرەیی راستەقینە لەو کاتەوە زیاتر دەستی پێکردوە.[21]

▪ زۆربونی مەلها و شوێنی لەشفرۆشی وایکردوە گەنج بە تاتبەت کوڕان پشت لە هاوسەرگیری بکەن

▪ قومارخانە و بارەکان بەشێکی ترن لە هۆکاری بڵاوبوونەوەی خراپە و پشتکردن لە هاوسەرگیری.

▪ بە ئاسانی و هەرزانی وەگیرکەوتنی خراپەکاری.

▪ تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان و پەیوەندە ناشەرعیەکان لەو ڕێیەوە هۆکارێکی بەهێزترن.

▪ ترسان لە بەرپرسیاریەتی هاوسەرگیری.

▪ زەمکردنی هاوسەرگیری لە لایەن گەنجانەوە بە هەردووک ڕەگەزەوە، ئەمە بۆتە نەریتێکی خراپ لە ناو گەنجاندا.

▪ بیرکردنەوە لە ئاوی خۆ هێنانەوە بە نەهێنی بۆ هەردووک ڕەگەز، کە بەشێک لە گەنجان پێیان وایە ئەمە بەدیل و جێگرەوەیە بۆ هاوسەرگیری، کە ئەمە بێجگە لەوەی کە گوناهو تاوانە، وە زیان بە تەندروستی کەسەکە دەگەیەنێ، وە بە هیچ شێوەیەکیش جێگرەوە نییە بۆ هاوسەرگیری.

[21] العنوسة .اسبابها۔ آثارها۔ علاجها/ عبد المنعم عثمان عبد الله
تأخر زواج الفتيات/ هارون عثمان
العنوسة أسبابها وحلولها الشرعية/ محمد عبد الله صالح القدح

## لەمپەری پازدەهەم: تەڵاق و بێوەژنایەتی

شتێکی سەیر نییە کە ئافرەت تەڵاق بدرێ و ببێتە بێوەژن بە هۆی تەڵاق یان مێرد مردن، بەڵام سەیر ئەوەیە کە ئەم بابەتە ببێتە کۆسپ لە بەردەم شوکردنەوە بۆ جاری دیکە، چونکە قەرار نییە هەرچی تووشی جیابوونەوە بوو لەبەر خراپی ژنەکە بێ، وە هە تا ئەگەر دامان نا واش بوو دەکرێ ئەم کەسە بە خۆی داهاتبێتەوە و پەندی وەرگرتبێ و خۆی چاککردبێ، بە تایبەت لە دوای ئەوەی بە کردەوە دەردی بێها و سەری دەبینێ و مناڵەکانی تووشی کێشەی دەکەن و ڕووبەڕووی پرسیاری بێزارکەری دەکەنەوە.

پێغەمبەری خوا کە باشترین مرۆڤە خێزانەکانی زۆربەیان بێوەژن بوون بێجگە لە عائیشەو مارییە، وە دەگوترێ تەنیا عائیشە بێوەژن نەبووە، ئەگەر ئەمە کارێکی خراپ و نەنگ بوایە هەرگیز پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام ئەنجامی نەدەدا، بەڵکوو ئەمە نیشانەی گەورەی و بەڕەحمی و میهرەبانی پێغەمبەری خوا بووە.

دەبێ ئەوەمان لە بەرچاوبێ کە لە مرۆدا ئافرەتی بێوەژن ژمارەکەی لە هەڵکشان دایە بە هۆی ئەو هەموو جیابوونەوەی کە ڕۆژانە ڕوو دەدا، ئەگەر ئەوە ببێتە لەمپەر لە بەردەم هاوسەرگیریدا ئەوە کارەساتی گەورەی لێدەکەوێتەوە، بۆیە با چاو لە سەرکردەو ڕابەرەکەمان بکەین بێوەژنیایەتی نەکەینە لەمپەرو کۆسپ لە بەردەم هاوسەرگیری، خوای گەورە لەگەڵ ئەوانەدایە بە یارمەتی خۆی کە چاکە کارن ئەمەش خۆی لە خۆیدا چاکەیە:

إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ (النحل: ١٢٨) واتە: بەڕاستی خوا لەگەڵ ئەوانەیە کە خۆیان پاراستووە (لە تاوان) هەروەها ئەوانەش کە چاکەکارن.

## لەمپەری شازدەم: پیاو ژنی تەڵاق داوە یان ژنی مردووە

ئافرەتان زۆر جار کە دەزانن پیاوێک ژنی تەڵاقداوە یان ژنی مردووە سڵی لێدەکەنەوە، کە ئەمەش وەک بابەتی پێشوو وایە نە عەیبە ، وە نەسەیرە، لەبەر ئەوەی لە کۆمەڵگای ئێمە پیاو قورسایی بە خێوکردنی ماڵ و منالی لە ئەستۆدایە لەوانەیە کەمتر داوای جیابوونەوە بکات، بەڵام بێگوومان هەیە، بەڵام پیاو دەبێ جارێکی دی دووبارە دەستبکاتەوە بە مەسرەف و ماڵدانانەوە، بۆیە بۆ ئەو دووجار سەخترە، بەڵام دەی ئەو پیاوە تاوانی چییە کە لەگەڵ ژنەکەیا کە نەیتوانیوە بەردەوام بێ لە هاوسەرایەتی، وە هەتا ئەگەر خەتاشی بووبێ ئێستا دەکرێ پەشیمانبێ و وانەی باشی وەرگرتبێ، وە بۆتە خاوەنی ئەزموونی زیاتر لە خۆناسی و خەڵک ناسیدا بۆیە بەڕاستی هەڵەو تاوانە ئەم بابەتە ببێتە کۆسپ لە بەردەم هاوسەرگیریدا.

## لەمپەری حەڤدەهەم: هەبوونی منال لەلایەن پیاوەوە یان لە لایەن ژنەوە

کۆسپێکی بەردەم هاوسەرگیری بوونی منالە لە لایەن کە سە تەڵاقدەرەکە، یان کەسە تەڵاقدراوەکە، یان ئەو ئافرەتی مێردی مردووە، یان لەلایەن ئەو پیاوەی خێزانی مردووە و منالی هەیە.

ڕاستی ناتوانین بڵێین ئەمە گرفت نییە بۆ هەردوو ڕەگەز، بەڵام دەکرێ ئەم گرفتە چارەسەر بکرێت بە ڕەچاوکردنی ئەم خاڵانە:

١) دەبێ هەردوولا بزانن ئەمە قەدەرێکی خوایە. مرۆڤ نازانێ لە ژیانیدا چیبەسەردێ ئەگەر مرۆڤ بزانێ چی بەسەردێ لە داهاتوودا هەوڵدەدا پێشیان پێبگرێ وەک خوای گەورە ئەمر بە پێغەمبەر دەکات علیه

الصلاة والسلام: ﴿قُل لَّآ أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعًا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ لَٱسْتَكْثَرْتُ مِنَ ٱلْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُ إِنْ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ (الأعراف: ١٨٨). واتە: ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) بڵێ: من خاوەنی هیچ سوودو زیانێک نیم بۆ خۆم مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ ئەگەر من نادیارەکانم بزانیایە خێرو خۆشی زۆرم بەدەست دەهێنا وە هیچ خراپە و زیانێکم پێ نەدەگەیی من تەنها ترسێنەرو مژدەدەرم بۆ خەڵکانێک کە باوەڕ دەهێنن.

٢) دەبێ بزانن ئەم کارە عەیبەی تێدا نییە نە لە ڕووی شەرعی، نە لە ڕووی کۆمەڵایەتی، کەواتە کەسەکە هەر ڕەگەزێک بێ کارێکی نەنگ و نەشیاو ناکات.

٣) گەورەترینی مرۆڤایەتی ئەو کارەی کردووە، کە پێغەمبەری خوا (ئوم سەلەمەی) داخوازی کرد) وتی: من تەمەنم زۆرە، پێغەمبەری خوا فەرمووی منیش تەمەنم زۆرە، وتی: منالم هەن، جەنابیان فەرمووی: منالەکانی تۆ وەک منالەکانی خۆم وان،وتی من کەسێکی توڕەم، ئەویش فەرمووی دوعات بۆ دەکەم کە خوای گەورە ئارامیت پێ بدات، دەبینی پێغەمبەری خوا چۆن بە دڵسۆزانە گرفتەکەی چارەسەرکرد و بۆ هەتا هەتا کردی بە خێزانی خۆی ئوم سەلەمەش تاجی دایکی بڕوادارانی لەسەرنا؟

٤) لە ناو هاوەڵان و پیاو چاکاندا ئەمە زۆر بووە کە کەسی خاوەنی منالْ شوی کردۆتەوە و سەرکەوتووش بووە، وەک چۆن لە پیاوانیشدا بووە.

٥) دەکرێ ئەم دوو کەسە پێش بڕیاری هاوسەرگیری تەواو بابەتەکە تاووتوێ بکەن و زیان و قازانجەکانی بەراورد بکەن، کەی زانیان بە لێکدانەوەی خۆیان سەرکەوتوو دەبن با ئەوسا بڕیار بدەن.

٦) دەبێ مرۆڤی گەورە هیمەتی هەبێ و بڕوای بە خۆی بێ مەرج نییە مرۆڤ لە ژیانیدا بەس کاری ئاسان و بچوک بکات، ئەگەر وابا ئەوە مرۆڤە گەورە و ناودارەکان هەرگیز بە پلە بەرزەکان نەدەگەیشتن.

٧) دەبێ ئەوەش لە بەرچاو بگرین کە ئەمە پاداشتی دوارِۆژی هەیە، چەندین پلەو پاداشتی گەورە دانراوە بۆ بە خێوکردنی هەتیو، چەند گەورەییە کە مرۆڤ بتوانی منالّی خەلّکانی دیکە وەک منالّی خۆی چاوەدێری بکات و چاکەیان لە گەلّدا بکات کە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی علیه الصلاة والسلام: ( كَافِلُ الْيَتِيمِ لَهُ أَوْ لِغَيْرِهِ، أَنَا وَهُوَ كَهَاتَيْنِ فِي الْجَنَّةِ ". وَأَشَارَ مَالِكٌ بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى.)[٢٢]

٨) بەخێوکاری هەتیو جای هی خۆی بێ، یان هی غەیری خۆی من و ئەو ئەواینە لە دوارِۆژدا لە بەهەشتدا، یەکێک لە ڕاوییەکان کە مالکە بە پەنجەی شایەتمان و ناوەڕاستی ئاماژەی دەکردن بە یەکەوە، دیارە مەبەست لە پاداشتی گەورەی ئەو کەسەیە کە منالّی هەتیو بە خێو دەکا، دەی ئافرەتیش ئەگەر ڕۆژێک ئەو ئەرکەی کەوتە سەرشان منالّی بێ دایکی پیاوەکەی بە خێوکرد کە ئێستا دایکیان نەماوە بێگوومان پاداشتی گەورەی دوارِۆژی دەستدەکەوێ، بە خێوکردنی پشیلەیە یان سەگێکی برسی دەبێتە هۆی ڕزگارکردنی کەسەکە لە ئاگر،ئەی دەبێ بە خێوکردنی منالّیک چەندە خێر بێ.

## لەمپەری هەژدەهەم : چەند ژنییەتی

دەبێ ئەمە لە چەند خالّێکدا ڕوون بکەینەوە لە بەرئەوەی قسەو باسی زۆری لەسەرکراوە:

١. ئیسلام چەند ژنییەتی دانەهیناوە بە لّکو ڕێکی خستووە.

---

[٢٢] ـ رواه مسلم، ٢٩٨٣

٢. بە پێی تەوارات و ئینجیل ئیبراهیم سەلامی خوای لەسەربێ دوو تا سێ ژنی هەبووە.

٣. بە پێی پەیمانی کۆن لە ئینجیلدا یەعقوب سەلامی خوای لێ بێ زیاتر لە سێ ژنی هەبووە.

٤. بە پێی پەیمانی کۆن لە ئینجیل دا داود نزیکەی چل ژنی هەبووە.

٥. بە پێی پەیمانی کۆن لە ئینجیل دا سولەیمان هەزار ژنی هەبووە، حەوت سەدیان ئازاد بوون، ئەوانیتر کەنیزەک بوون.[٢٣]

٦. لە ئەدیانی هیندی چەند ژنی ڕێگا پێدراو بووە.

٧. لای زەردەشتییەکانچەند ژنی ڕێگا پێدراو بووە.

٨. لای ڕۆمانەکان چەند ژنی ڕێگا پێدراو بووە.

٩. هەتا لە ناو گیاندارانیش ئەم یاسایە دەبینرێ کە دەبینی بە دەیان مەڕ یان بزن یان مریشک نێرەیەکیان هەیە.

١٠. ژمارەی ئافرەتان لە بەرامبەر پیاواندا لە سێ حاڵان بەدەر نییە.

یەک: ئەگەر ڕێژەی ئافرەتان لە پیاوان کەمتربوو ئەوە ئافرەت ناچار نییە بە چەند ژنییەتی ڕازیبێ چونکە لە بەرامبەریدا پیاوی بێژن هەیە.

دوو: ئەگەر ڕێژەکەیان وەکو یەکبوو دیسان پێویست نییە بە هەوێیەتی ڕازی بن چونکە کەسێک لە بەرامبەر ئەودا بێ ژن وەستاوە.

سێ: ئەگەر ژمارەی ئافرەتان زیاتر بێ، ئەوکات چ بکەین؟

---

[٢٣] ـ الکتاب المقدس، العهد القدیم، 

لەوکاتەشدا دیسان سێ ڕێگا لە بەردەستدایە، بەڵام بزانین کام لەم سێ ڕێگایە ڕەوایەو لە بەرژەوەندی پیاودایە:

ڕێگای یەکەم: ئافرەت بێبەش بکرێ لە هاوسەرگیری و مەحرووم بێ و شوو نەکات، دیارە لەو کاتەدا زیانباری گەورە ئافرەتەکەیە کە لە مافێکی شەرعی خۆی بێ بەشدەکرێ.

ڕێگای دووەم: ڕێگای ئیباحیەت و ڕابواردن، لەوکاتەشدا هەر ئافرەت زیانبار دەبێ بە هۆی ئەو هەموو دەرد و بەڵاو نەخۆشیەی کە لە کۆمەڵگادا بڵاو دەبێتەوە.

ڕێگای سێیەم: ئەوەیە کە بە چەند ژنیەتی ڕازیبێ لە چوارچێوەی شەریعەت و بە مەرجی دادگەری، ئەوە لە هەموو ڕێگاکان زیاتر لە بەرژەوەندی خودی ئافرەتدا، ئافرەت تێیدا سەربەرزە و ماڵ و جێگاو و ڕێگاو نەفەقەی خۆی هەیەو سەربەخۆیی خۆشی دەپارێزێ، وە دەتوانێ مناڵ بخاتەوە و بە ئازادی میوانداری دۆست و خزم و هاورێ بکات و هیچ قسەیەکیشی نایەتەوە سەر.

١١.ئەگەر سیکۆلار ڕێگا بە چەند ژنییەتی نادا ئەوە لەبەر ئافرەتی نییە، بەڵکو ئامانجی گەورە هەرزانکردنی ئافرەت و بە کاڵاکردنییەتی، دەنا ئەگەر پەرۆشی ئافرەتیەتی با ڕێگا لە پیاو بگرێ کە لە گەڵ چەندین کەسدا ڕابوێرێ و سزای بۆ دانێ، ئایا ئەوە دەکات؟ بێگوومان نەخەیر!

١٢ .ئافرەتان خۆیان بەشێکن لە کێشەکە و بیر لە بەرژەوەندی خۆیان ناکەنەوە دەنا لە هەموو حاڵەتێک باشتر بۆ ئەوان ڕازیبوونە بە چەند ژنیەتی یان فرەژنی چونکە بشوترێ فرەژنی لە ئیسلامدا هەر چوار ژن ڕێگا پێدراوە.

١٣. ڕێکخراوە فیمینیستییەکان ئیشیان بە ئافرەتی بارکەوتوو و بێکەس نییە، ئافرەت بە لای حەزپەرست و سیکۆلارەکان تەنیا ئافرەتی گەنج و جوانە بۆ ئەوەی بە ئامانجی خراپ بە کاریبێنن، دەنا بە تایبەت لە وڵاتی ئێمە ئەم

هەموو کچە قەیرە و بێوەژنە هەیە بایی گەردیلەیەک سوودیان بۆ ئەو جۆرە ئافرەتانە نەبووە.

١٤. دەبێ کۆمەڵگا بە هەموو توێژەکانیەوە بابەتی چەند ژنییەتی ئاسایی بکاتەوە، بۆ ئەوەی ئافرەت شەرم نەکا بەوەی کە بە چەند ژنییەتی ڕازی بێ.

١٥. خۆزگە پیاوانیش دادگەرییان ڕەچاو دەکرد لە کاتی ئەنجامدانی پرۆسەی فرەژنی.

١٦. خۆزگە پیاوان ئامانجەکانیان لە چەند ژنییەتی تەنیا ڕابواردن نەدەبوو، بەڵکو زیاتر بواری کۆمەڵایەتی کۆمەڵگایان ڕەچاو دەکردو، چەند ژنییەتیان وەک چارە سەر وێنا دەکرد نەوەک ببێتە هۆی گرفت و بەڵگە بە دەست بێدینەکانەوە.

١٧. دەبوو دەسەڵاتیش پاداشت و پێشینە پێدان و ئاسانکاری بکات بۆ بابەتی چەند ژنییەتی مەرجی جوان و دادگەرانە دابنێ کە لە بەرژەوەندی کۆمەڵگابێ و بەگشتی ئافرەتانیش بە تایبەت.

١٨. دەبێ ئەوەش بڵێین ئەو بابەتە لە ناو زیندەوەرانیشدا هەر یاساییە، کە دەبینین ئەم دوو ڕەگەزە ژمارەکانیان یەکسان نین، بە ڵکو بە زۆری ژمارەی مێیینەکان زیاترە، ئەوانەی ڕێگا لە چەند ژنییەتی دەگرن هیچ بەدیلێکی زانستی و دادگەرانەیان پێ نییە تەنیا گروگاڵە.

١٩. بێجگە لەوەی لە ڕووی زانیستیشەوە ئافرەت هەم لە سپێرمی پیاو هەم لە هی خۆی دوو جار چانسی بوونی هەیە، بەڵام پیاو تەنیا یەکجار.[٢٤]

[٢٤] بە پێی زانستی بایۆلۆجی، نێرینە خاوەنی هەردوو کرۆسۆمی (Y,Y )، مێیینەش (X,Y).

٢٠. ئافرەتان لەسەردەمی ئێستادا بەشێکی بەرچاویان زەحمەتی بەڕێوەبردنی خێزانیان کەوتۆتە ئەستۆ ئەگەر پیاو هاوکاریان نەکات، ئەوە ستەمیان لێ ناکات بەتایبەت ئێمە باسی کەسی بە دین و ڕەوشت بەرز دەکەین.

٢١. بەشێکیش لە ئافرەتان بە هەر هۆیەک بووە دەرفەتی ئەوەیان لە دەستچووە کە بتوانن شووی بە کەسی بێژن بکەن، جا لەبەر هەر هۆیەک بێت.

٢٢. لە ئێستادا گەنجان زۆربەیان پشتیان لە هاوسەرگیری کردووە، باشە ئەگەر گەنجەکان هاوسەرگیری نەکەن و خێزاندارەکانیش ژن نەهێنن و بۆیان نەبێ ئەی چارەسەر چییە؟!

## لەمپەری نۆزدەهەم: بەدکرداری کەس وکاری ژن یان پیاو

بە پێی شەریعەتی ئیسلام کەس تاوانی کەس هەڵناگرێ مەگەر تاوانێک کەسەکە تێیدا هۆکاربێت، وەک خوای گەورە دەفەرموێ:

مَّنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا (الإسراء: ١٥) واتە: هەر کەس ڕێنموونی وەرگرتبێ ئەوە بێگومان ڕێنمونیەکەی هەر (سوودی) بۆ خۆیەتی و هەرکەسیش گومڕا بووبێ ئەوە بێگومان (زیانەکەی) هەر لە دژی خۆیەتی وە هیچ کەسێکی گوناهکار گوناهی هیچ کەسێکی تر هەڵناگرێ ئێمە هەرگیز سزای (بەندەکان) نادەین هەتا پێغەمبەر نەنێرین بۆیان.

بەڵام ئەگەر کەسێک ببێتە هۆکاری تاوان ئەوە لە بەر ئەوەش گوناهبار دەبێ وەک خوای گەورە دەفەرموێ: لِيَحْمِلُوٓا۟ أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَمِنْ أَوْزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ (النحل: ٢٥) واتە: بۆ ئەوەی باری گوناهی خۆیان بەتەواوی هەڵ بگرن لە ڕۆژی دوایی دا لەگەڵ هەندێ لەباری گوناهی

ئەوانەی کە ئەمان گومڕایان دەکردن بە بێ زانیاری بێدار بن زۆر بەدە ئەوەی کە هەڵی دەگرن و دەیگرنە ئەستۆ.

نکوڵی لەوە ناکرێ کە یەکێک لە ئامانجەکانی هاوسەرگیری پەیوەندی کۆمەڵایەتییە، بەڵام ئەگەر ئەوە نەبوو نابێ ئەو کەسانە بێ بەش بکرێن لە هاوسەرگیری لەبەر خراپی کەسوکاریان.

دەکرێ وا لەو ژن و پیاوە بکرێ کە پەیوەندییەکانیان لە گەڵ کەسوکارە خراپەکانیان سنوردار بکەن، دەست تێوەردان نەکەن لە کاروباری ئەو کەسانە بە تایبەت ناو ماڵ و کاری تایبەتی و خێزانی ئەو ژن و مێردە کاتێک کە هاوسەرگیری دەکەن. مرۆڤ بۆ خۆی ئازادە کە ئەو جۆرە هاوسەرگیرییە دەکات یان نا، بەڵام ناکرێ لە هەموو کاتێکدا ببێتە پەرچ و لەمپەر لە بەردەم هاوسەرگیریدا.

## لەمپەری بیستەم: لەمپەری جادوو

گومان لەوەدا نییە کە جادوو لەمڕۆدا کە لە خواترسان لە کۆمەڵگادا تییدا کەمبۆتەوە زۆر زیادی کردوەو کۆمەڵگا پێیەوە سەرگەردان بووە، بە تایبەتی لە ناو ئافرەتان زۆر پەرەی ساندوەو زۆریش بڕوایان پییەتی پارەی زۆری تێدا سەرفدەکەن، بەڵگەی تاوانبوونی جادوو زۆرە لە قورئان و فەرموودەدا لەو بەڵگانە:

١. وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتْلُواْ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَٰنَ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَلَقَدْ عَلِمُواْ

لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ (البقرة: ١٠٢). واتە: جا جووەکان (وازیان لە کتێبی خوا - تەورات - هێناو) شوێنی ئەوە کەوتن، کە شەیتانەکان دەیانخوێندەوە دەربارەی دەسەڵات و حکومەتی سولەیمان، (ئاشکرایە کە) هەرگیز سولەیمان کافر نەبووە، بەڵکو شەیتانەکان کافربوون و خەڵکیان فێری سیحرو جادوو دەکرد، هەروەها مەردومیان فێری ئەوە دەکرد کە بۆ هاروت و ماروت دابەزی بوو (کە دوو فریشتە بوون) لە بابل (مەبەستیشیان تێگەیاندنی خەڵکی بوو لە سیحرو جادوو). ئەوانیش کەسیان فێری هیچ شتێک نەدەکرد تا پێیان نەوتایە: ئەم کارەی ئێمە بۆ تاقی کردنەوەیەو خۆت کافر مەکە (کەچی هەندێک هەر کۆڵیان نەداو) لەو فریشتانەوە شتی وافێر دەبوون کە ژن و مێردی پێ لە یەک جوودا بکەن، (هەر چەندە) ئەو جادووگەرانە ناتوانن هیچ زیانێک بە کەس بگەیەنن، مەگەر ویستی خوای لەسەر بێت، ئەو خەڵکە سەرگەردانە هەمیشە فێری شتێک دەبن کە زیانیان لێدەداو سوودی نیە بۆیان، بێگومان دەشزانن ئەوەی کاڵای وای کڕی بێت و شتی وافێر ببێت لەو دونیا هیچ بەهرەیەکی دەست ناکەوێت، (بەڕاستی) ئەو شتەی ئەوان خۆیان پێ فرۆشتووە و کەوتونەتە داوییەوە شتێکی زۆر ناپەسەندە ئەگەر بزانن و تێبگەن (چونکە سیحرو جادوو چەواشە کاریە و کارێکی نادروستە).

دەبینین لەو ئایەتە پیرۆزەدا دەردەکەوێ کە بابەتێکی گرنگی جادوو بریتییە لە لێکجیاکردنەوەی هاوسەران

٢. پێغەمبەری خوا سورەتی ( الفلق و الناس ) وەک چارەسەری ئەو جادووە بۆ دابەزی کە لێی کرابوو هەر چەند بەشێک لە زانایان ئینکاری کاریگەری جادوو دەکەن و پێیان وایە تەنیا دەستسووکی و چاو خەڵەتاندنە، لە ڕاستیدا ئەمە بشێکییەتی نەوەک هەموو جۆری جادوو.

٣. ناتوانین ئینکاری ئەو واقیعە تاڵە بکەین، کە بەشێک لە هاوسەران تێی دەکەون و کێشەو گرفتی لابەلایان لە گەڵ هاوسەرانیان بۆ دروستدەبێ، دوای بەکارهێنانی ڕوقییەی شەرعی هەست بە باشبوون دەکەن.

٤ . بابەتی سەرەکی ئێمە لێرەدا ئەوەیە: ئایا دەکرێ جادوو ڕێگر بێ لە بەردەم هاوسەرگیری؟ من پێموایە بەڵێ، بەڵام دەبێ چارەسەربکرێ:

- بە پشت بەستن بە خوای گەورە.

- خۆ چارەسەرکردن بە ڕوقییەی شەرعی.

- سەردانی ئەو کەسانە بکات کە لەو بوارەدا شارەزایە بۆ ئەوەی چارەسەری بۆ بکات.

- بەڵام مەرج نییە ئەوەی ئێمە وا دەزانین بە هۆکاری جادوویە جادوو بێ بە واقعی، دەبێ ئەوەش لەبەرچاو بگرین لە بەر چەندین هۆکاری دیکە گەنجان پشتیان لە هاوسەرگیری کردووە، کە ئێمە ئەو بەرگەمان تەرخانکردووە بۆ باسکردنی لەمپەرەکانی بەردەمهاوسەرگیر و لێکەوتەکانی و چارەسەرەکانی.

- بەشێک لە گەنجان تەواو تووشی قەلەکی و دڵە ڕاوکێی بوون و بە زەحمەت بڕیاری هاوسەرگیریان بۆ دەدرێ.

کەواتە بەڵێ دەکرێ یەکێک لە کۆسپەکانی بەردەم هاوسەرگیری جادووکردن بێ، بەڵام ئەوەش بە نیشانە و بەڵگەی تەواو دەبێ بسەلمێنرێ.

## لەمپەری بیست و یەکەم: چاوزار

دیارە وەک بابەتی جادوو گرفت و ڕاجیایی لە سەر چاوەزاریش هەیە، بەڵام بەڵگەکان بە تایبەت فەرموودە زۆر باسیکردووە و تەئکیدی لەسەردەکاتەوە، لە سێ جێگاش لە قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێکردووە:

**یەکەم:** وَقَالَ يَٰبَنِيَّ لَا تَدْخُلُواْ مِنۢ بَابٍ وَٰحِدٍ وَٱدْخُلُواْ مِنْ أَبْوَٰبٍ مُّتَفَرِّقَةٍ وَمَآ أُغْنِي عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيْءٍ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَعَلَيْهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ (يوسف: ٦٧).[٢٥]
واتە: هەروەها وتی: کوڕەکانم، هەمووتان لە یەک دەروازەوە مەچنە ژوورەوە و لە چەند دەروازەیەکی جیا جیاوە بچنە ژوورەوە (خۆتان بکەن بە شاردا)، دڵنیاش بن کە من ناتوانم هیچ شتێک لەو بەڵاو پێشهاتانەی کە بڕیاری خوای لەسەر بگێڕمەوە لە ئێوە، هیچ فەرمان و بڕیارێک بۆ کەس نی یە، تەنها بۆ خوا نەبێت، پشتم هەر بەو بەستووە و پشت و پەنام هەر ئەوە، جا دەبا ئەوانەی کە پاڵپشت و پشتیوانیان دەوێت هەر پشت بەو ببەستن.

هەرچەند ئەم دەقە پیرۆزە بەڵگەی ڕاشکاو نییە لەسەر بابەتی چاوپیسی، بەڵام ڕاڤەکارانی قورئان ئاماژەیان پێکردووە، وە هیچ مانعێک نییە کە ئەو واتایەش بگەیەنێت.

**دووەم:** وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَٰرِهِمْ لَمَّا سَمِعُواْ ٱلذِّكْرَ وَيَقُولُونَ إِنَّهُۥ لَمَجْنُونٌ (القلم: ٥١) وەبەڕاستی ئەی پێغەمبەر! () ئەوانەی کە کافر و بێ بڕوابوون نزیکە لەرق و بەچاویان هەڵتدێرن {لما سمعوا الذكر} وەختێ کە قورئانیان

---

[٢٥] - أنوار التنزيل واسرار التأويل/ الامام البيضاوى
فتح القدير / الامام الشوكانى
تفسير السمعانى/ منصور بن محمد بن عبد الجبار التميمى السمعانى
عون الرحمن في تفسير القرآن/ أ.د. سليمان بن ابراهيم بن عبد الله اللاحم
التفسير الصحيح ـ موسوعة التفسير المسبور من التفسير بالمأثور/ أ.د. حكمت بن بشير بن ياسين

بیست. (ئیبن کەسیر) دەڵێ: (فی هذه الآیة دلیل علی أن العین إصابتها وتأثیرها حق بأمرالله عز وجل ..). [٣٦]

واتە: ئەم ئایەتە بەڵگەیە کە چاوی پیس بەویستی خوا رۆڵ و دۆزی خۆی دەبینی و دەتوانێ زیان بگەیەنێت بەوشتە بۆی دەڕوانێت، هەروەک چەند فەرموودەیەکیش لەو بارەیەوە هاتوون و دەڵێن:.[٣٧] (العین حق، ولوکان شئ سابق القدر سبقت العین، وإذا استُغْسِلْتُمْ فاغسلوا ). [٣٨] یان دەفەرموێ: (لا عدوی، ولاطیرة ولاهامة ولاحسد والعین حق ) ئیمامی (ئەحمەد ) ریوایەتی کردووە. {ویقولون إنه لمجنون} وە لەگەڵ ئەوەیشدا ئەڵێن: بەڕاستی ئەو (موحەممەد )ـە شێتە ! باشە! ئەگەر شێتە بۆچی ئەوەندە بەخەفەتەوەن و لێی دەترسن و، هەر رۆژەی توانجێکی لێ ئەگرن ؟

هەرچەند ئایەتەکە زۆر ڕاشکاو نییە دەربارەی ئەو واتایە بەڵام ئاماژەی تێدا، وە فەرمودەکانیش لەو بارەوە روونن،

سێیەم: بەڵام لە واقعی کۆمەڵگادا ئەمە ڕوونەو بڕوا پێکراوە، خەڵک بە تەواتوور ئەو ڕووداوانە دەگێڕنەوە، بە پوختی دەکرێ ئەمەش بە کۆسپ دابنرێ بەڵام ئەم گرفتانە بە پشت بەستن بە خوای گەورە، وە بە ڕوقیەی شەرعی دەکرێ چارەسەربکرێن، ناکرێ بە بەردەوامی بە کۆسپ و لەمپەر بمێنننەوەو چارەسەریان نەبێ چونکە بە پێی فەرمودە هەموو دەردێک دەرمانی هەیە بێجگە لە مردن، وەک پێغەمبەری ئازیز دەفەرموێ: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : " مَا أَنْزَلَ اللَّهُ دَاءً إِلَّا أَنْزَلَ لَهُ شِفَاءً. [٢٩] کەواتە بە پێی ئەم فەرموودە دەبێ هەموو دەردێک دەرمانی هەبێت.

---

[٣٦] تفسیر القرآن العظیم/ الامام ابن کثیر.

- رواه ابوداود، ٢٩٣ [٣٧]

رواه مسلم، ١٧١٩ [٣٨]

[٢٩] - رواه البخاری، ٥٦٧٨

چوارەم: ناکرێ ئەمە لە ڕووی زانستیەوە ئینکاری بکرێت، چونکە زانست بوارەکەی جیاوازە، ئەگەر نەشی سەلمێنێ، بەڵام ناتوانی ئینکاری بکات، چونکە ئەوە بوارێکی دیکەیە.

## لەمپەری بیست و دووەم: هاوسەرگیری پێشوەختە

خوێنەری خۆشەویست! لە چەن خاڵێکدا ئەم باسە دەخەینەڕوو:

### یەکەم: هاوسەرگیری پێشوەختە چییە؟

دوو پێناسە هەیە بۆ هاوسەرگیری پێشوەختە:

یەکەم: هاوسەرگیری پێشوەخت ئەوەیە: کە هاوسەرگیری بکرێ پێش تەمەنی یاسایی، دیارە وڵاتانی جیهانی جیاوازن لە دیاریکردنی تەمەنی یاسایی وەک دواتر باسی دەکەین.

دووەم: هاوسەرگیری پێشوەخت ئەنجامدانی هاوسەرگیرییە پێش پێگەیشتنی لاشەیی و دەروونی و ژیری.

ئەگەر بە پێی قسەی زانایانی شەریعەت دیاری بکەین ئەویش جیاوازی زۆری لەسەرە لە نێوان زانایاندا.

### دووەم: ئایا تەمەنی شەرعی بۆ هاوسەرگیری چەندە بە تایبەت بۆ کچان؟

- ئایا تەمەنی شەرعی بۆ شووکردن نۆ ساڵە؟
- یان شازدە ساڵە؟
- یان حەڤدە ساڵە؟
- یان هەژدە ساڵە؟
- یان هەرکاتێک کەوتە سوری مانگانەوە؟

- یان تەمەنی دیاری کراو نییە بۆ هاوسەرگیری بە تایبەت بۆ کچان؟

بەڵام دەبێ ئەوەمان لە بەرچاو بێ لە ئێستادا وڵاتانی ئیسلامی و نا ئیسلامی تەمەنی یاساییان دیاری کردووە بۆ هاوسەرگیری، وە سزاشیان داناوە بۆ سەرپێچی کاران.

ئایا ئەو تەمەنانەی کە دیاری کراوە دەکرێ ئێمە لە ڕووی شەرعییەوە پێیەوە پابەند بین یان نا؟ مەبەستم یاسای باری کەسێتی وڵاتانی ئیسلامییە.

بەڵێ دەبێ پێیەوە پابەندبین، چونکە لە وڵاتانی ئیسلامی ئەو کەسانەی بەم بوارە هەڵدەستن کەسانی یاسازان و شەرع زانن، بەڵام بەمەرجێک ئەو تەمەنە لەسەر بنچینەیەکی تەندروست دانرابێ، نەوەک لە ژێر فشاری سیستەمی جیهانی و ڕێکخراوە فیمینستەکان و لادەرە جینسییەکان.

ئەم کتێبە بۆ ئەوە دانەنراوە بۆ ئەوەی موناقەشەی ئەم بوارە بکات، بەڵکو بۆ ئەوەیە من وەک لەمپەرێک باسی هاوسەرگیری پێشوەخت دەکەم.

## سێیەم: ئایا چ تەمەنێک گونجاوە بۆ هاوسەرگیری؟[٣٠]

ئەگەر کەمێک لەسەر داتا جیهانیەکان بوەستین بۆمان دەردەکەوێ کە تەمەنی هاوسەرگیری لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر جیاوازە.

لە نێوان ١٣ بۆ ٢١ ساڵی هەیە. کەواتە دەستورەکان پشتیان بە زانست و شتی سەلمێنراو نەبەستووە دەنا نەدەبوو جیاوازیان هەبا لە نێوانیاندا.

---

[٣٠] ـ الزواج المبكر وتحديد سن الزواج، فهد بن محمد بن محمد الغفيلي،
الزواج المبكر، دراسه فى المفهوم والاسباب والآثار/نوال عبد الرحمن حمزة،سعاد هادى الحابسي، ليلى محمد حزورة،حنان ناصر حاجب.

بەڵام کۆمەڵێک خاڵ هەیە دەبێ لە بەرچاوی بگرین:

١ـ ئەگەر ئەم تەمەنانە زانستی بوونایە بۆ نموونە ٢١ساڵی دەبوو پێش ئەوکات نێرو مێ مەیلیان بۆ یەکتر نەبایە، وە نەدەبوو جیاوازیان هەبا لە نێوان وڵاتەکاندا.

٢. دەبوو بیانتوانیبا ڕێگرییان کردبا لە مومارەسەی سێکسی.

٣. دەبوو ئەمانە لە خوار ئەو تەمەنە منالْیان نەبووبایە .

٤ـ ئافرەت کە دەکەوێتە سوڕی مانگانەوە مانای ئەوەیە کە ڕەحمی ئامادەیە خواردن بۆ کۆرپەلە دابین بکا و ئامادەیە بۆ منالْ، ڕێگری لە هاوسەرگیری نازانستییە.

٥ـ دەکەوێتە سەر ئەوەی کە بوترێ ئافرەتەکە لە ڕووی ژیری و دەروونییەوە ئامادە یان نا؟ ئەمەش هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە.

٦ـ من لە گەڵ ئەوەدام کە پابەندی بە یاساکانەوە بکرێ، بەڵام دەستی حاکم واڵا بکرێ، کە هەر کات پێی گونجاوبوو پێش ئەو تەمەنە زەواجەکەیان بۆ بکاو دەستی نەبەسترێ، بەم کارە تەواو خۆمان لە لێکەوتە خراپەکان دەپارێزین.

٧ـ وە دەبێ یاسای وا دابنرێ کە نەتوانرێ ئەم دوو ڕەگەزە هەرچی بیانەوێ بە یەکەوە ئەنجامی بدەن، بۆ ئەوەی خراپە و منالْ لە بارچوونی لێنەکەوێتەوە.

## لەمپەری بیست و سێیەم: جیاوازی تەمەنی کوڕو کچ

یەکێک لە کۆسپەکانی بەردەم هاوسەرگیری جیاوازی تەمەنی کوڕو کچە، هەرچەندە نەدەبوو ئەوە گرفت بێ مەگەر ئەو کارە بە زۆر ئەنجام بدرێ وەک لە زوودا ئەم کارە ڕوویداوە، بەڵام لە ئێستا ئەوە ئەنجام نادرێ، وە ئێستا جیاوازی تەمەن لە ئەوروپا ڕەچاو ناکرێ، سەرۆکی فەرەنسا بە ٢٥ساڵ خێزانەکەی لە خۆی گەورەترە، بابەتی هاوسەرگیری تەواو پەیوەندی بە ڕەزامەندی هەردوولاوە هەیە جاری وایە ئافرەت ئەوەندەی متمانە بە کەسێکی لە خۆی گەورەتر دەکات متمانە بە هاوتەمەنی خۆی یان لە خۆی بچوکتر ناکا. ئەمە هیچ تاوانی تێدا نییە.

### سەرنجێکی گرنگ و پێویست!

### بابەتی جیاوازی تەمەنی پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام لەگەڵ دایکمان عائشە ڕەزای خوای لێبێت:

دیارە مولحیدەکان زۆر ئەو بابەتە دەوەروژێنن و خۆیان بە پارێزەری دایکمان عائشە دەناسێنن. دیارە بابەتی حەقیقەتی جیاوازی تەمەنی ئەم دوو زاتە لە دوو حاڵەلان بەدەر نییە:

یەکەم: فعلەن جیاوازی تەمەن بەو ئەندازەیە کە لە فەرموودەکەدا هاتووە، واتە بە نۆ ساڵی شووی بە پێغەمبەری خوا کردووە.

دووەم: نەخەیر وانییە لەو کاتەدا دایکمان عائیشە ئافرەتێکی پێگەیشتوو بووە و کاتی هاوسەرگیری بووە، کەمن زیاتر قەناعەتم بەو ڕایە هەیە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: وَٱبْتَلُواْ ٱلْيَتَـٰمَىٰ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُواْ ٱلنِّكَاحَ فَإِنْ ءَانَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا فَٱدْفَعُوٓاْ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ وَلَا تَأْكُلُوهَآ إِسْرَافًا وَبِدَارًا أَن يَكْبَرُواْ وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَن

كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِٱلْمَعْرُوفِ فَإِذَا دَفَعْتُمْ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ فَأَشْهِدُواْ عَلَيْهِمْ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا (النساء: ٦) واتە: هەتیوان تاقی بکەنەوە لە ڕووی ماڵدارییەوە هەتا دەگەنە تەمەنی هاوسەرگیری.

بە پێی وتەی زانایانی سەرمەزهەب تەمەنی پێگەیشتوو لە پازدەوە دەست پێدەکات تا هەڤدەو هەژدە، ناکرێ پێغەمبەری خوا سەرپێچی ئایاتی قورئانی کردبێت؟!

بە هەرحاڵ من باسی خراپترین ئەگەر دەکەم کە تەمەنە بچوکەکەیە لەم خاڵانەدا:

یەکەم: بە پێی دەقەکان ئەمە بە وەحی ئەنجامدراوە وەک لە فەرموودەدا هاتووە کە: عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهَا : " أُرِيتُكِ فِي الْمَنَامِ مَرَّتَيْنِ ؛ أَرَى أَنَّكِ فِي سَرَقَةٍ مِنْ حَرِيرٍ، وَيَقُولُ : هَذِهِ امْرَأَتُكَ فَاكْشِفْ عَنْهَا. فَإِذَا هِيَ أَنْتِ، فَأَقُولُ : إِنْ يَكُ هَذَا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ يُمْضِهِ ."[٣١]

پێغەمبەری خوا بە عائیشەی فەرمووە من لە خەودا دوو جار تۆم نیشاندراوە واتە: وێنەی تۆ لە قوماشێکی ئاوریشمدا وە پێیان وتووم ئەوە خێزانەکەتە، سەیری بکە، کاتێک کە سەیرم کرد تۆ بووی، منیش وتم ئەگەر ئەو خەوە لە خواوە بێ ئەوە وەدی دێ.

دووەم: پێغەمبەری خوا نمونەی ئەوپەری دادگەری و میهرەبانی بووە ، واتە هیچ ستەمێک لە عائیشە ناکا

سێیەم: باوکی عائیشە کەسێک بووە نمونەی گەورایەتی و دادگەری بووە ئەگەر ئەو کارە ستەم بووایە نەیدەکرد.

---

[٣١] - رواه البخاری،٣٨٩٥

چوارەم: دووژمنەکانی سەردەمی پێغەمبەر زۆر لە پێغەمبەری خوا لە قین بوون، ئەگەر ئەمە پێچەوانەی حەق و عەدالەت و نەریتی کۆمەڵایەتی بوایە بێگوومان پێغەمبەری خوایان علیه الصلاة والسلام پێ تاوانبار دەکرد.

پێنجەم: عائیشە کە خۆی خاوەنی بابەتەکەیە ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕەخنەی لەو بابەتە نەکردووە، بەڵکو بە پێچەوانەوە بەردەوام شانازی بەو زەواجەوە کردووە.

شەشەم: ئەم زەواجە لە چوارچێوەی نەریتی کۆمەڵایەتی ئەنجام دراوە، نە زۆر لێکردن بووە و نە دەستدرێژی سێکسی بووە هەتا ڕەخنەی لێبگیرێت.

حەوتەم: عآئیشە نزیکەی پەنجا ساڵ دوای پێغەمبەری خوا ژیا، دەبوو ڕۆژێک لە ڕۆژان باسی ئەو ستەم و مەینەتییەی خۆی کردبا ئەگەر بەراستی ستەم بووە، بەڵکو ڕاست بە پێچەوانەوە هەموو کات وەک شانازی ئەمەی باسکردووە.

هەشتەم: لە کۆمەڵگای ئێستادا دەستدرێژی سێکسی بۆ سەر مناڵانی کوڕو کچ یەکچار زۆرە نەشتوانتراوە ڕێگری لێبکرێ، وە هەتا لە ناو کەنیسەکاندا مندڵبازی ئەنجام دەدرێ بێجگە لەوەی هەندێک جار لە پۆستەکەیان لایان دەدەن چ ئیجرائاتێکیان بەرامبەر دەکەن؟ هیچ، بۆیە باسی کەنیسە دەکەم، چونکە ئەوانەی ڕەخنە لە هاوسەرگیری پێغەمبەر دەگرن یان گاورەکانن یان بە کرێگیراوەکانیانن لە مولحیدەکان.

## لەمپەری بیست و چوارەم: بەشوودانی کچی گەورە پێشتر

ئەم گرفتە پێشتر باو بوو ئێستا زۆر کاڵبۆتەوە، وە لە وانەیە دەگمەن بێ، بەڵام خاڵێکی تر هەیە کە دەبێ ئاگاداری بین ئەویش پێناخۆشبوونی خوشکی گەورەیە کاتێک خوشکی بچوک داخوازی دێ، ئەوە ئەگەر بە گووتەش نەیڵێ بە دەم و چاوی و هەڵس و کەوتییەوە دیارە، لەوانەیە ئەوە وا لەو خوشکە بچوکە بکات بۆ ئەوەی خوشکی گەورەی نیگەران نەبێ بڕیاری هاوسەرگیری نەدا، یان لانیکەم دڵخۆش و ئارام نەبێ لە بڕیارەکەی، دیارە ئەمە بۆ برای بچوک و گەورەش هەر ڕاستە، دیارە جاران دایکان و باوکان ڕاستەوخۆ ڕێگردەبوون لەم جۆرە هاوسەرگیرییە، دەیانووت هەتا خوشکی گەورە شوو نەکات، یان برای گەورە ژن نەهێنێ ئێمە ڕازی نابین، جا بۆیە نابێ براگەورە و خوشکە گەورەو گەورەکان بە هیچ شێوەیەک نارەزایی دەرببڕن لە سەر ئەم هاوسەرگیرییە چونکە ژیان دەرفەتە با ئێمە نەبینە ڕێگر لە بەردەم ئەم دەرفەتە، وە ئەوەش هەر هەڵەیە کە خوشکی گەورە دەرفەتی بۆ دەرەخسێ بەڵام دەیەوێ گەورەیی بنوێنێ دەڵێ تا خوشکی بچوکم دانەمەزرێ من شوو ناکەم، ڕاستە ئەوە دڵسۆزییە، بەڵام بڕیارێکی ڕاست نییە دەکرێ لە دوای شوکردنیش هەوڵی باش بدات بۆ بە شوودانی خوشکە بچوکەکەی یان ژن هێنانی برا بچووکەکەی، بۆیە با ئێمە نەبینە کۆسپ لە بەردەم کەسدا کە بیەوێ بە شێوەیەکی جوان هاوسەرگیریی بکات، چونکە ئەوەی ئاسانکاری بۆ خەڵکانی تر بکات و هاوکاریان بکا خوای گەورە کاری ئەویش ئاسان دەکات، وەک پێغەمبەرمان دەفەرموێ علیه الصلاة والسلام: **( والله فی عون العبد ماکان العبد فی عون أخیه)** [٣٢] واتە: خوای گەورە لە یارمەتی بەندەکەیدا مادام بەندە لە یارمەتی خوشک و براکانی دابێت.

[٣٢] -رواه مسلم،٢٦٩٩ -

## لەمپەری بیست و پێنجەم : خزمەت کردنی دایکوباوک

گومان لەوەدا نییە کە چاکە لە گەڵ دایکوباوک لە دوای بەندایەتی بۆ خوا لە هەموو شتێک گەورەترە، لە دوای خۆشەویستی و گوێڕایەڵی بۆ خوا جل جلالە خۆشەویستی گوێڕایەڵی بۆ پێغەمبەرەکەی خۆشەویستی و گوێڕایەڵی دایکوباوک لە هەموو کەس ئەولاتر و لە پێشترە، بەڵام خوای گەورە مافی هەمووانی داوە، چ دایکوباوکان بن، وە چ منداڵەکان بن، بۆیە با ئێمە کەس نەکەین بە قوربانی کەس، چونکە دایکوباوکان هەمیشە بەوە کامەران و بەختەوەر دەبن کە ببینن منداڵەکانیان دەبنە خاوەنی خێزانێکی بەختەوەر، هەڵبەتە ئەگەر خوای گەورە دەرفەتی هاوسەرگیری بۆ کوڕێک یان کچێک نەڕەخساندوو وە ئەوان خزمەتی دایکوباوکیان کرد بێگوومان ئەوە خێرێکی زۆر گەورەیان بەو کارە دەستدەکەوێت و دەبێت نزای خێریان بۆ بکەین لە جیاتی سەرکۆنەکردن و گازندەکردن لێیان، چونکە خزمەتکردنی دایکوباوک لە هەموو کارێک گەورەترە، بەڵام بینیویشمانە کە دایکان ڕێگری دەکەن لە بەشوودانی کچەکانیان یان لانیکەم پێیان ناخۆشە لەبەر خزمەتکردنی خۆیان، پێویستە ئەوان بزانن بەم کارەیان خراپە لە گەڵ منداڵەکانیان دەکەن.

## لەمپەری بیست و شەشەم: دەست تێوەردنی خزم و کەسوکار

لە ناو خزمایەتیدا ڕاگۆڕینەوەو پرس و ڕاوێژ شتێکی باشە لە کاتی پێویست و بۆ کاری پێویست، بەڵام مەرج نییە ئەمە لە هەموو کاتێکدا بە کارێکی باش دابنرێ، بە تایبەتیش جار وا هەیە هەندێک لە کەسوکار باش نین و نییەتیان باش نییە. ئەگەر بۆیان بکرێ کارەکە تێکدەدەن لە جیاتی ئەوەی کە ڕێکیخەن. بە شوودانی کچ بە پلەی یەکەم بەندە بە خوودی کچەکەوە دواتر باوکودایکی، پێویست ناکات لە کارێکی ئەوادا پرس بە هەموو کەس بکرێ، هەتا بازنەی پرس و ڕا فراوانتر بێ بابەتەکە ئاڵۆزتر دەبێت، دەکرێ لە

کاتی خۆیدا بۆ کاتی داخوازی یان مارەکردن خزمە لە پێشەکان ئاگادار بکرێنەوەو ئامادە بن بۆ ئەوەی خزمایەتی توندو تۆڵبێ و گلەیی نەکەن.

زۆر جار بینیومانە بە داخەوە ئامۆزا یان خاڵۆزا یان براژن و یان دۆستێک بۆتە هۆکاری تێکدانی کارەکە، یان جار وایە کوڕێکی خزم هەڕەشەی لەو کەسە کردووە کە بەتەمای داخوازی بووە، یان درۆ و بوختانی کردووە بۆ ئەوەی کەسی بەرامبەر دڕدۆنگ بکات دەربارەی پرۆسەکە. پێویستە پێوەر لای ئێمە خودی کوڕەکە بێت، مادام لە دین و ئەخلاق و کەسایەتی ڕازین نابێ کۆسپ دروست بکەین.

## لەمپەری بیست وحەوتەم: مارەکردنەوەی خێزانی برا یان نزیکان

زۆر جار بیسیوومانە یان بینیومانە کە کەسێک ویستوویەتی هاوسەرگیری بکا خزم و کەسو ار، یان دایکوباوک پێیان وتووە دەبێ خێزانی برات یان کەسێکی نزیک مارە بکەیەوە، دیارە ئەم کارە کە کوڕو ژنەکە ڕایان لەسەر بێ کارێکی زۆر باشە، بەڵام نابێ لەسەریان پێویست بکرێ و ڕێگریان لێبکرێ کە هاوسەرگیری لە گەڵ کەسانی دیکەدا بکەن، چونکە لێکەوتەی خراپی لێدەکەوێتەوە و بۆی هەیە بە یەکتر دڵخۆش نەبن و نەتوانن بەردەوام بن.

## لەمپەری بیست و هەشتەم: هەڕەشەکردن لە لێستاندنەوەی مناڵەکان ئەگەر شوو بکاتەوە

لە هەموو کۆمەڵگاکان ئافرەت زیاتر ستەمی لێدەکرێ چ دەربارەی ماڵ و سامان بێ، یان دەربارەی هاوسەرگیری بێ، یان بەهۆی بە کارهێنانییەوە بێ بەخراپە لەلایەن کۆمپانیا و فیمینیست و سیستەم و لە دین حاڵی نەبووەکانەوە ، یەکێک لەو ستەمانە کە لە ئافرەت دەکرێ لە کاتێکدا کە

منالّی هەبێ بە هۆی ئەوەی کە تەلّاق دراوە، یان مێردی مردووە پێی دەوترێ ئەگەر شوو بکەیەوە منالّەکانت لێدەستێنینەوە، ئەویش دەکەوێتە بەردەم بڕیارێکی قورس، یان دەبێ قوربانی بە خۆی بدا، یان بە منالّەکان ناچار زۆربەی کات قوربانی بە خۆی دەدا و هاوسەرگیری ناکاتەوەو بێبەشدەکرێ لەو مافە گرنگ و ئاساییە کە خوای گەورە ئەو مافەی پێداوە.

ئەم بابەتە لایەنی شەرعی و قانوونی و ئیدارەیی هەیە، هەروا هەڕەمەکی نییە، هەر کەس بتوانێ ژن لە منالّەکانی دابڕێ ئەگەر شوو بکاتەو.، ئەی باشە ئەگەر جێگرەوی لە دایک باشتر نەبوو؟ ئەی باشە ئەگەر منالّەکان بەوە ڕازیبوون ؟ ئەی ئەگەر کەس و کاری منالّەکان دلّسۆز نەبوون، یان نەچوونە ژێر ئەو بارە؟، ئایا هەر دەکرێت ئەم دایکە بێ ماف بکرێ دەربارەی هاوسەرگیری و منالّەکانی؟ بێگوومان نەخێر.

بۆیە دەبێ مامۆستایانی ئاینی و یاساناس و ئافرەتانیش لەم بابەتە ئاگادار بن بۆ ئەوەی ئافرەت بە هۆی هاوسەرگیرییەوە ستەمی لێنەکرێت.

## لەمپەری بیست و نۆیەم: هەستنەکردنی منالّەکان بە پێویستی دایکیان بە هاوسەرگیری

لەوانەیە هەندێک کەس ئەوەی پێ سەیربێ کە وەک کۆسپ و لەمپەر باسم کردوە. بەلّام ئەوەهەر زۆر زۆرە لە ئێستادا بە داخەوە، زۆر دەبینین منالّەکان گەورەن دەزانن دایکیان گەنجە لە پێناو خۆشی خۆیان ئەوە بەداکیان ڕەوا نابینن کە شوو بکاتەوەو داهاتوویەک بۆ خۆی مسۆگەر بکات.

### نموونەیەکی جوان:

برادەرێک بۆی گێرامەوە وتی: لە گەڵ کەسێک چووین بۆ داخوازی ئافرەتێکی عەرەب کە منداڵەکانی گەورەبوون و خاوەن شەهادەی بەرزبوون، وتی: کەچووین زۆر بە ڕێزەوە بە خێر هاتنیان کردین و وتیان ئەو دایکەمان هەموو ژیانی خۆی کردۆتە قوربانی ئێمە، بۆیە ئێمەش دەمانەوێ ئەو بە دڵی خۆی شوو بکا و ئەوپەڕی هاوکاریشی دەکەین، وە لە لای خۆمان ماڵ و کەلو پەلیشمان بۆ دابین کردووە.

ئەو برادەرە وتی: ژنەکەمان مارەکرد و ئەو برایەی کە من لە گەڵی چووم بۆ ئەو داخوازییە هەر لەوێ مایەوە و یەکجاری بوو بە خاوەنی ماڵەکە و لەگەڵ من نەگەڕایەوەو من تەنیا هاتمەوە.

بەراستی هەڵوێستێکی جوانی ئەو کوڕە تێگەیشتووانەیە لە هەست و نەستی دایکیان.

### لەمپەری سییەم: بیانوو بەوە دەگرێ ئەو کچەم بۆ خزمی خۆم داناوە لە منالیەوە

دیارە ئەم بیانووەش لە کۆمەڵگا نموونەی هەبوو، وە ئێستاش هەیە، بە تایبەت دایکان بێ پرسی کچەکان و ئاگاداری ئەوان بڕیاریان دەدا کە ئەو کچەم بۆ برازاکەم، یان خوشکەزاکەم، یان خزمێکم، یان ناسیاوێکم داناوە، لەو کاتە ئەم کچە کەس داخوازی ناکات جارێکی تر، هەڵبەتە زۆر جار نەوەک هەموو کاتێک، چونکە دەوترا ئەمە دانراوە بۆ کەسێک ، جا گرفتەکە لێرەدایە کە دایکەکە ئەوە بە گوێی خەڵک دادەدات کە لە کاتێکدا کچەکە ئاگادار نییە، یان ئاگادارە، بەڵام ڕازی نییە، یان نەیووتوە ناڕازایم، بەڵام هیچ هەڵوێستی

دەرنەبڕیووە، جا جاری وایە باوک ئەمە دەکات، یان برا، یان خوشک، بەڵام هەموو ئەوانە هەڵەن، دەبنە کۆسپ لە بەردەم هاوسەرگیری.

## لەمپەری سی و یەکەم: ئامادەنەبوونی کەسوکاری داخوازیکار

جار واهەبووە کوڕەکە لە گەڵ باوکی گرفتی هەبووە، مەرج نییە کوڕەکە ناهەق بێ، کاتێک دەیەوێ داخوازی بکات، باوکەکە ئامادە نابێت و گرفت دروستدەبێت، چونکە کەسوکاری کچەکە دەڵێن بۆ باوکت ئامادە نییە، یان باوکت ئامادە نەبێت نابێت، یان تا قسەی لەگەڵ نەکەین نابێت، لەو کاتەدا کوڕەکە دەکەوێتە مەوقیفەوە و کێشەی بۆ دروستدەبێت.

لەم حاڵەتدا دەبێ ئەوەمان لە بەرچاو بێت کە کوڕەکە ئەسڵی بابەتەکەیە مادام کەسێکی باش و گوونجاوە با ڕەتینەکەینەوە و دەست بە ڕوویەوە نەنێین، وە دەتوانین خۆمان بیانووی باشی بۆ بێنینەوە، دەتوانین دەوری باش بگێڕین و ببینە هۆکاری ئاشتەوایی لە نێوان ئەو کوڕو باوکە، چونکە مرۆڤ کە نییەتی خێربوو خوای گەورە کاروباری بۆ ئاسان دەکات بە تایبەت لایەنی ئاشتەوایی، پێغەمبەریش فەرموویەتی: **(والله في عون العبد ماكان العبد في عون أخيه.)**

## سی و دووەم: گرفتی جوانی و ناشیرنی کچ بە وێنای کەسوکارەوە

من زۆرم بیستووە و بینیوومە کە زۆر جار کوڕەکە بە کچێک ڕازیبووە، بەڵام لەبەر قسەی کەسوکار کوڕەکە کچەکەی لە بەرچاو کەوتووە، مرۆڤ دەبێ لە خەڵک بگەڕێ، چونکە هەرکەس تێڕوانینی خۆی هەیە بۆ جوانی و ناشیرنی کەسێک. گرفتی دەوروبەر ئەوەیە تەنیا جوانی دەبینێت، وە پێوەر بەس

جوانییە، پێش هەموو شتێک یەکەم پرسیار ئەرێ جوانە؟ تەمەنی چەندە؟ پرسیار ناکەن لە کەسایەتی، ڕەوشت، دین، بنەماڵە، ڕۆشنبیری، ئەمە وا لەکوڕەکە دەکات دڕدۆنگ بێ سەبارەت بە کچەکە و دەکەوێتە دڵەڕاوکێ و هاوسەرگیرییەکە هەڵدەوەشێتەوە، وە ئەگەر سەریش بگرێت، کوڕەکە بە نا بەدڵی بڕیارەکە دەداتو هاوسەرگیرییەکە دەکات، دیارە ئەم بۆ کچ خراپتریشە، چونکە کچان زیاتر تووشی دڵەڕاوکێ دەبن لە هاوسەرگیری.

ئەگەر کەسێک پرسی پێکردی بە ویژدانەوە وەڵام بدەرەوە، بزانە ئەوەی پرست پێدەکات هەستەکانی چۆنن؟ وە چەند ئەو کچە، یان ئەو کوڕەی بە دڵە؟ بە دڵێ بە دڵبوون لە ڕووی دیمەنەوە گرنگە، بەس جوانی هەمووی لە دیمەندا نییە.

## سی و سێیەم: داواکاری دینداری تەواو

ئەوکاتەی دەتەوێ کچێک هەتا ئەوپەڕ بەدین بێت ،  ئەوە دەکەیە مەرج، ئایا خۆشت هەمان دینداری؟  دینداری چییە؟،

گرنگ ئەوەیە کچەکە یان کوڕەکە خاوەنی کەسایەتی بێ، فەرزەکان جێبەجێ بکا، خراپەی وای نەبێت کە کەسایەتی کەسە کە بڕوشێنێ و لە کۆمەڵگا عەیبدار بێت، نابێ چاوەڕوانی شتی وا بکەین کە مومکین نەبێت، یان زۆر دەگمەن بێت، هاوسەرگیریش خۆی کەسایەتی باش بۆ مرۆڤ دروستدەکات و دەیکاتە کەسێکی وا کە هەڵگری بەرپرسیارییەتی بێ و بە خۆیدابێتەوە لە زۆربەی بوارەکانی ژیانیدا، ڕاستە هەموو کەسێک حەزدەکات بەرامبەرەکەی نمونەی هەرە جوانی دینداری بێت، بەڵام ئەوە هەمووکات دەستگیرنابێت، دینداریش ئەوە نییە کە کەسەکە بە تەنیا زۆر هاتووچۆی مزگەوت بکات، زۆر بە ڕۆژو بێت و زیکر و قورئانخوێندنی زۆر بێت، بەڵێ ئەوانە باشن، بەڵام زۆر کەس هەیە ئەوانەی هەیە، بەڵام هەڵسوکەوتی باش نییە کەسێکی نائارامە و لە گەڵ بەرامبەرەکانی توندووتیژە، یان لە ڕووی ماڵدارییەوە

چرووكە، یان كەسێكی دوودڵ و گوماناوییە، كەواتە دەبێ ئێمە جوان لە وشەی دینداری تێبگەین بۆ ئەوەی بە هەڵەدا نەچین لە كەسی دیندار.

## سێ و چوارەم: كەمئەندامییەتی داخوازیكار و داخوازیكراو

ئەوانەی كە خاوەنی پێداویستی تایبەتن لە كۆمەڵگادا دەبێت زیاتر ڕەچاوی باری دەروونی و لاشەیی و داراییان بكرێت و ئاسانكاریان بۆ بكرێت لە هەموو بوارەكاندا بە تایبەتیش بواری هاوسەرگیری و بواری دارایی، لە ئێستادا دەبینین لە سایەیی دەسەڵاتی گەندەڵ كەمترین یارمەتی دەدرێن و موچەكەیان بەشی چارەسەرەكانیان ناكات، مەگەر ئەوەی بە دەگمەن توانای بزنس و مامەڵەی گەورەی هەبێت، یان باوك براكانی خوا پێداوبن و یارمەتی بدەن و پێویستی بەكەسانیتر نەبێت.

بابەتی هاوسەرگیری بۆ ئەوان گرفتی زیاترە بە حوكمی دارایی و پێداویستییە تایبەتییەكەیان، بەڵام ئەوانە ئەركی دەسەڵات و ئەركی كۆمەڵگایە كە یارمەتیان بدەن و ئەوانەی كە دەتوانن لە بوارێكدا كاربكەن هەلی كاریان بۆ فەراهەم بكرێت، دیارە چۆن ئافرەتی خاوەن پێداویستی تایبەت هەیە، پیاوی ئەواش هەیە، دەتوانرێ ئەو كەسانە لە نێوان خۆیاندا كاری هاوسەرگیرییان بۆ ڕێكبخرێت، خوای گەورە دەفەرموێ: وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ (المائدة: ٢)

پێغەمبەری خواش دەفەرموێ علیه الصلاة والسلام: **(والله فی عون العبد ماكان العبد فی عوم أخیه.)**

## سی و پێنجەم: لەبەرئەوەی پێشتر داخوازی خوشکی کردووە

پێشتریش ئاماژەمان پێدا، بەڵام لێرە بەتایبەت دەمەوێ ئەم بابەتە باس بکەم، چونکە بە واقعی بۆ زۆر کەس بۆتە گرفت، لە ڕاستیدا نابێت ئەمە کۆسپ بێت لە بەردەم هاوسەرگیرییدا مادام ئەم دووانە ئێستا بۆ یەک گونجاون و کێشەیان نییە با پێشتریش داخوازی خوشکی کردبێت، یان پێشتر برای ئەو کوڕە داخوازی کردبێت و نەگونجابێ گرنگ ئەوەیە ئێستا بۆ یەک گونجاوبن و بەیەک ڕازیبن. هەتا ئەگەر کەسێک ژنێکی تەڵاق داو لەگەڵ خوشکەکەی هاوسەرگیری بکات بێ شەرعی نییە، ڕاستە بایی خۆی کێشەی هەیە، بەڵام لەڕووی شەرعییەوە گرفتی نییە. بۆیە ئێمە دەبێ کۆسپی حەقیقی بە کۆسپ بزانین نەوەک شتی خەیاڵاوی و بە پێی نەریتی خراپی کۆمەڵگا گرفت بێت.

## سی و شەشەمین: باوکودایک حەزدەکات کوڕەکەی لای خۆی بمێنێت

لە ڕاستیدا باوکان و دایکان هەڵە دەکەن کە ئەوە بکەنە کۆسپ و لەمپەر لە بەردەم هاوسەرگیریدا بۆ کوڕەکەیان، بەتایبەت کە پیویستیان بە کوڕەکەیان نەبێ و موحتاج و ناتەواو نەبن لە ڕووی لاشەیی و دەروونیی و مادییەوە، سروشتی مرۆڤ ئەوەیە کە حەزدەکات ئازادو سەربەخۆ بێ بە تایبەت ئەوانەی کە سەرەتای هاوسەرگیرییانە، وە مافی خۆشیانە، باوکودایک سروشتیان ئەوەیە کە لە پێناو منداڵەکانیان قوربانی بە خۆشیەکانی خۆیان بدەن نەوەک بە پێچەوانەوە، بەڵام منداڵەکان دەبێ خۆیان هەست بەوە بکەن کە ئایا دایک و باوکیان چەند پێویستیان بەوانە، نابێ پشتیان بەردەن و بێ نازیان بکەن، جاری واش هەیە کوڕ یان بووک قەدری ئەوە نازانێ کە لە باوک و دایکیان نزیک بن بۆ ئەوان چ نیعمەتێکی گەورە و ئاسانکارییە بە تایبەت کە منالّیان

پەیدا دەبێت، ئەو کاتانەی کە نەخۆش دەکەون، دیارە ژن و مێردەکان تا خۆیان نەبنە خاوەنی منالْ لە هەست و نەستی دایکایەتی و باوکایەتی تێناگەن. بۆیە سەرەتا زۆر بە سەختی نزیک بوون لە دایک و باوکی پیاوەکە ڕەتدەکەنەوە، بەڵام ئەگەر باوک و دایک پیویستیان بەو کوڕە بوو، هیچ دەرەتانێکیان نەبوو ئەوکات دەبێ هاوکاریان بکەن و لێیان نزیک بن، بووکەکەش وا جوانە هاوکاری هاوسەرەکەی بێ بۆ ئەوەی ژیان لەو هاوسەرە تێک نەچێ و تووشی ئیحراجی و بێزاری نەبێت، دیارە ئەمە بۆ دایک و باوکی کچەکەش هەر ڕاستە دەبێ پیاو هاوکاری خێزانەکی بێ بۆ ئەوەی بتوانێ خزمەتی باوک و دایکی بکا لە کاتێکدا کەسێکی تریان نییە، یان هەیانە، بەڵام دوورن، یان ناتوانن هاوکاریان بن، هەموو ئەوانە لە چوارچێوەی هاوکاریکردنی یەکتردا جێگای دەبێتەوە کە خوای گەورە فەرمانی پێکردووە کە دەفەرموێ: (وتعاونوا على البر والتقوى) جا چ کارێک لەوە باشترە کە مسوڵمان هاوکاری لێقەوماوان بێ، جا ئەو لێقەوماوەش باوکان و دایکان بن.

## سی و حەوتەم: ڕەتکردنەوەی لەبەرئەوەی بالآپۆش نییە

جاری وایە کچێکی باش و خاوەن و کەسایەتی و بنەماڵە هەیە، ئامادەی هاوسەرگیریشە، بەڵام بالآپۆش نییە، ئایا دەکرێ ئەم کارە ڕێگرو لەمپەر بێت لە بەردەم هاوسەرگیری لە گەڵیدا؟

### ئایە بالآپۆشی نەبوون لەمپەرە لە بەردەم، ئەم بوارەدا؟

**یەکەم:** سەرەتا دەبێ بزانین بۆ حیجاب و بالآپۆشی ناکات؟

ئایا نەیزانیوە کە بالآپۆشی واجبە؟ ئایا کەسوکاری ڕێگرن؟

ئایا پێی وایە بالآپۆشی گرفتی بۆ دروستدەکات؟

یان توشی توانج و پلاری دەکاتەوە لە لایەن کەسوکار و هاوڕێکانییەوە؟

وا تێگەیشتووە ڕێگا لە پێشکەوتن و ئازادی دەگرێ؟

هەر نەریتی ماڵەوەیان ئەوایە کە بالآپۆش نین؟

دەڵێ تا شوونەکەم بالآپۆشی ناکەم؟

تا بە ساڵانەچم بالآپۆشی ناکەم؟

بڕوای بە بالآپۆشی نییە؟

**دووەم: چارەسەری ئەم بارودۆخە:**

ئێمە دەتوانین لە سەر بنچینەی گرفتەکانی کە لەگەڵ بالآپۆشیدا هەیەتی گفتووگۆی لە گەڵدا بکەین و قەناعەتی بگۆڕین، بۆیە کارێکی هەڵەیە بەس لەبەر ئەوەی بالآپۆشی ناکات هاوسەرگیری لە گەڵدا نەکرێ، چونکە زۆربەی حاڵەتەکان قابیلی چارەسەرکردنن، دەبێت ئەوەش بزانین کە ئافرەتان زوو دەچنە سەر قەناعەت و بیروباوەڕ و بیروڕای هاوسەرەکانیان، بۆیە باشترین چارەسەر بۆ ئەو حاڵەتە ئەوەیە کە پیاو لەگەڵ هاوسەرەکەی باش بێت و خۆی

لا خۆشەویست بکات. ئەو کات پێویستی بە ئامۆژگاری و بڕیارِ بەسەرداداندا نییە، ئەو خێزانە بزانێت هاوسەرەکەی چی پێخۆشە خۆی ئەوە دەکات، دەبێ ئەوەش بزانین کە بالآپۆشی نەکردن دەچێتە چوارچێوەی تاوان، نەوەک بێ دینی و بێ ئیمانی!!

## سی و هەشتەم: لەمپەری نیقاب نەکردن

من ناڵێم نیقاب باش نییە، بەڵکو ئەوپەڕی تەقواو لە خوا ترسانە. دەبێت ڕێز لەو کەسانە بگرین کە ئەو کارە دەکەن، بەڵام نابێت پێویستی بکەین لەسەر خەڵک، بە تایبەت کە ئافرەت خۆی نەیەوێ نیقاب بکات. نابێ و شەرعی نییە بکرێتە کۆسپ لە لەبەردەم هاوسەرگیریدا، وە پێچەوانەی ڕای زۆربەی زانایانە، کەسێک حەزی لە نیقابپۆشی خێزانەکەیەتی دەبێ قەناعەتی پێبێنێ نەوەک بە زۆر بەسەریدا بسەپێنێت، چونکە ئەم پەرچەکرداری خراپی لێدەکەوێتەوە، من لێرەدا موناقەشەی حوکمی نیقاب ناکەم، بەڵکو لە باسی ئەحکامەکانی هاوسەرگیری باسی ئەو بابەتە دەکەین بە پێی پێویست بە پشتیوانی خوای گەورە.

## سی و نۆیەم: هاوکاری نەکردنی باوکودایکان بۆ داخوازیکار و داخوازیکار

١. کوڕان دەبێ پشت بە خۆیان ببەستن و لەسەرپێی خۆیان بووەستن بۆ تەواوی کاروباری ژیانیان. هەتا بۆ بابەتی هاوسەرگیریش ئەگەر بۆیان گونجاو کاریان بۆ دەستەبەر ببێت.

٢. بەخێوکردنی مناڵەکان لە سەر باوکان پێویستە، هەرکاتێک ئەوان پێویستیان بێت و ئەو باوکەش توانای دارایی هەبێت

٣. باوک مادام توانای ماددی باشی هەیە، یان بەشی ئەوەندەی هەیە هاوسەرگیری بۆ کورەکەی بکات با بیکات، ئەگەر کەمتەرخەمی بکات گوناهبار دەبێت، چونکە هاوسەرگیریش یەکێکە لە پێداویستییە بنچینەییەکانی ژیان، بە تایبەت لەم سەردەمەدا کە مەعلوومە ژیان و خێزان چیان بەسەر هاتووە.

٤. باوکودایک پێویستە لە ڕووی دینییەوە خۆیان بە بەرپرس بزانن، نابێ لێبگەڕێن منالەکانیان تووشی تاوان و خراپەکاری بن.

٥. ئەگەر هەر خێزانێک بەم ئەرکە گرنگە هەڵبستێت بۆ منالەکانی ئەوە خراپە لە کۆمەڵگا بە شێوەی بەرچاو کەمدەکات، ئەوەش ئەرکێکی ئایینی هەموو لایەکمانە.

٦. منالەکان دەبن بە سێ بەشەوە:

یەکەم: بەشێکیان دەستەوستانن لە کارکردن و خۆ ژیاندن ئەوانە باوکان دەبێت حەتمەن هاوکاریان بن بۆ هاوسەرگیریکردن و یارمەتیدانی بەردەوامیان مادام باوکان دەتوانن ئەوە بکەن.

دووەم: بەشێکیان دەتوانن کاروباری ماددی خۆیان ڕێکبخەن، ئەوانە لەوانەیە بە کاتیی پێویستیان بە باوکوداکیان بێت، ئەوانە دەبێ هاوکاری بکرێن تا لەسەر پێی خۆیان دەوەستن.

سێیەم: بەشێکیان پێویستیان بە یارمەتی کەس نییە، ئەوانە باش نییە ئەرک بخەنە سەر کەس، بەڵکو لازمە پشت بەخوا ببەستن و کاروباری خۆیان بۆ خۆیان ڕێکبخەن.

ئەگەر منداڵەکان لەبەر بواری فێربوونی زانستی نەتوانن کارو کەسابەت بکەن، باوکەکە توانای دارایی هەبوو با هاوکاری منداڵەکان بێ تا لەسەر پێی خۆیان دەوەستن. لەوانەیە باوک کۆمەڵێک پاساوی هەبێ بۆ یارمەتی نەدانی کوڕەکە وەک ئەوانە:

- کە کچەکەی بە دڵ نییە.
- یان گرفتی لە گەڵ کەسوکاری کچەکە هەیە.
- یان لەبەرئەوەیە کچەکە لە خوێندندایە.
- یان لە بەرئەوەیە ویستوویەتی کوڕەکەی خزمی خۆی بێنێ.
- یان باوکەکە چروک و ڕەزیلە.
- یان لە ژیری و دینداری و کەسایەتی کچەکە ڕازی نییە.
- یان باوک پێی وایە ئەرکی ئەو بەرامبەر منداڵەکانی تەنیا خوێندن پێ تەواوکردنە و هیچی دی.
- یان لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە خۆیان باڵاتر دەبینن لە کچەکە و کەسو کاری کچەکە.
- یان لە بەرئەوەی کچەکە دایکوباوکیان لێکجیابوونەوە.

- یان پێی وایە کوڕەکەی هێشتا منالە و ناتوانێ ئەرک و بەرپرسیاریەتی خێزان هەڵبگرێ.

شایانی باس بیانووی تریش زۆرن، بەڵام ئێمە پێش هەموو شتێک دەبێ بە پێوەری شەرع تەماشا بکەین ئایا ئەو پاساوانە شەرعین یاخود نا؟

ئایا هەندێک لەوانە شایەنی چارەسەرکردن نین؟

ئایا دەکرێ کوڕو کچێکی گەنج وەک کەسێکی کامڵ یان بە ساڵاچوو بیربکەنەوە؟

ئێمە دەبێ تۆزێک خۆمان لەو قۆناغە هەستیارەی ئەوانیش نزیک بکەینەوە و لەوانیش تێبگەین ئەوجار بڕیار بدەین لە هاوکاریکردن و نەکردنیان بۆ هاوسەرگیری.

خاڵێکی دیکەی گرنگیش هەیە دەبێ بیزانین، ئەویش ئەوەیە: خۆ نابێت ئێمە دوای هاوسەرگیری پشتیان بەردەین و وێڵیان بکەین، ئەوەشمان لا ئاسایی بێ کە منالەکانمان گرفتیان هەبێت، یان جار یوایە سەرکەوتوو نابن لە هەڵبژاردنیاندا، ئەوە مانای ئەوە نییە هەموو شتێک کۆتایی پێهاتووە، چونکە ژیان تاقیکردنەوە و کەوتن و هەستانەوە و تاڵی و شیرنییە، ئەمە بۆ هەموو کەس ڕاستە.

## چلەم: ڕێگری کەسوکاری داخوازیکراو لەسەفەر لەگەڵ هاوسەرەکەی:

بۆ ئەم بابەتە پێویستە تەماشاکەین ئایا ئەو شوێنەی ئەو ئافرەتەی بۆ دەچێت شوێنێکی باشەو دڵنیایین لە دین و ڕەوشت و گیانی یان نا؟ خۆ ئەگەر دڵنیا نەبین مافی ڕێگریمان هەیە وەک دایکوباوک، یان دڵنیایین لە سەلامەت و دین و رەوشت و گیانیان، وە کچەکەش ئەوەی هەڵبژاردووە دەکرێ ئێمە ڕێگر نەبین، بەڵکو دەتوانین بەرچاوڕوونی بدەینە کچەکەمان بۆ ئەوەی سپەی گلەییمان لێ نەکات، وە ئەگەر هیچکام لەو دووانە نەبوو دەتوانین تەواو خۆمان دڵنیا بکەینەوە ئەوجار بە پرس و ڕا لەگەڵ خێزان و کچەکە و داخوازیکارەکە بڕیاربدەین، مادام ڕێگریمان خراپەی لێنەکەوێتەوە، چونکە زۆر کەس کە ڕێگریان لە کچەکە کردووە زیانی گەورەی بە خۆی کچەکەیی و کەسایەتی خۆیان گەیاندووە، گرنگ ئەوەیە لە دوای تاوتوێکردنی تەواوی بانەتەکە دەبێ بڕیارِ بدەین، نەوەک بە خێرائی و بە سەرپێی.[٣٣]

---

٣٣ ـ المرأة المسلمة بين غرائز البشر وهداية الاسلام/ دكتور صابر عبد الرحمن طعيمة.

عقبات الزواج وأخطارها الكبرى في حياة أمتنا الاسلامية/. طارق بن عبد الواحد بن علي.

عقبات في طريق الزواج/ محمد بن عبد الله الهبدان.

يا بنتي / الشيخ علي الطنطاوي..

عقبات الزواج وطرق معالجتها على ضوء الاسلام/ عبد الله ناصح علوان.

موسوعة الزواج الاسلامي السعيد/ الشيخ محمود المصري.

مكتبة الاسرة المسلمة/ خالد عبد الرحمن العك.

قواعد تكوين البيت المسلم/ الدكتور أكرم رضا .

## بەرایی

### ئەزیزانم!

دیارە لێکەوتە و شوێنەوارەکانی کۆسپ و لەمەپەرەکانی بەردەم هاوسەرگیری لەسەر کۆمەڵگا یەکجار زۆرە، لە زۆر لاوە کاریگەری نەرێنی هەیە بۆ سەر هەموو لایەنەکانی ژیان، لە بواری: (دینداری، کۆمەلایەتی، ئابووری، تەندروستی، بواری کەمبونەوەی گەنج و دەستی کار، ئاکارو ڕەفتارەکان.)

دیارە دواکەوتن و نەمانی هاوسەرگیری واتە: زۆربوونی قەیرە و زۆربوونی بێوەژن با بزانین لێکەوتەی ئەوە چی گرفتێک لە کۆمەڵگا دروستدەکات، ئەم بابەتە بە چەند خاڵێک ڕووندەکەمەوە بە پشتیوانی خوای گەورە:

### یەکەم: دیاردەی قەیرەیی:

سەبارەت بە بابەتی قەیرە چەندین پرسیار هەیە لەوانە:

١) پێناسەی قەیرە چییە؟
٢) بە چ تەمەنێک دەوترێ قەیرە؟
٣) کێ قەیرە دیاری دەکات؟
٤) ئایا قەیرە بۆتە گرفت؟
٥) ئایا دروستە بڵێین قەیرە یان دواکەوتنی هاوسەرگیرییە؟
٦) ئایا سەربەخۆیی مادی گرفتی قەیرەیی چارەسەر دەکات؟
٧) ئایا قەیرە بەس بۆ کچان بە کاردێت، یان دەکرێ بۆ کوڕانیش بە کاربێت؟
٨) ئایا لێکەوتە خراپەکانی قەیرەیی چییە؟

دیارە وڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە پێویستی بە کتێبی سەربەخۆ و لێکۆڵینەوەی مەیدانی هەیە، بەڵام دەکرێ ئێمە سوود وەرگرین لەو داتایانە کە لە وڵاتانی ئیسلامی ئەنجام دراون، لەوانەیە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامی ئەو گرفتەیان هەبێ و پێیەوە بناڵن.

## پرسیاری یەکەم: قەیرەیی چییە؟

قەیرەیی واتە: مانەوەی کچ دوای ماوەیەکی زۆر لەپاش قۆناغی باڵغبوونی، بەڵام تەمەنی دیاریکراوی نییە ئەمە دەگۆڕدرێ لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆیەکێکی تر . بەپێی بیروڕای لەیەکچوو لەهەموو کۆمەڵگەیەک قەیرەیی لەدوای تەمەنی سی ساڵییەوە دەست پێ دەکات، ئەمەش مانای ئەوە نییە کە هەروا بمێننەوە، بەڵام لەوانەیە ئەگەری مانەوەی بەم شێوەیە زۆرتربێت .

زۆربەی کچان ئەو وشەیە ڕەت دەکەنەوە و بە وشەیەکی پڕ لە ئازاری لێکدەدەنەوە لەبەرتێکچوونی باری کۆمەڵایەتی و دەروونی بۆ کچان و هەندێکیش وای دادەنێن ئەو ناوە لوغزێکی سەربەخۆییە لەسەربەخۆییەکانی ژیانی کچان کە هەڵیدەبژێرن، چونکە لەچاوی هەندێکیانەوە شووکردن بەستنەوەیەکە بۆیان، ئەمە بیروڕای سروەی تەمەن ٣٤ ساڵە پێیوایە زۆربەی کچان خۆیان حەز بەشوو ناکەن و بە بەستنەوەی دادەنێن.

## بە چ تەمەنێک دەوترێ قەیرە؟

بەپێی پێوەرەکانی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان، هەر کچێک تەمەنی لە ٣٥ ساڵ تێپەڕێت و هاوسەرگیری نەکات، بە قەیرەکچ هەژمار دەکرێت.

پێویستە ئەوەش بوترێت: هەندێک کچ لەخۆپەرستییەوە دەگەنە قەیرەیی بوون.

ئارەززوو کەریم کچێکی تەمەن ٣٢ ساڵە وتی: قەیرەیی یەکێکە لەو دیاردانەی لەئێستادا بەپێی ئامارو داتاکان هەڕەشە لەکۆمەڵگەی کوردی دەکات هەڵبەت ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ هەندێک هۆکار کەپێوەندیدارە بەکۆمەڵگەوە من وەک خۆم کەتەمەنم ٣٢ ساڵەو دانیشتووی هەولێرم لەقۆناغێکدا کەداواکارم زۆربوو بڕیارمدابوو ئەوکەسەی دێتە داوام دەبێت تەواوی داواکاریەکانم جێبەجێ بکات بەڵام زۆربەی ئەوانەی دەهاتنە خوازبێنیم

کاتێک دەیانزانی من کەسێکی خۆپەرستم بۆیە لەگەڵم ڕێک نەدەکەوتن دواجار ئەمانە بوون بەهۆی ئەوەی بمێنمەوە ئێستاش کەزۆرێک لەو شتانەی پێشتر داوام دەکرد وازم لێهێناوە بەڵام تازە تەمەن تێپەڕیوەو ناگەڕێتەوە بۆیە ئارەزووم وایە کچانی تر هاوشێوەی من بیرنەکەنەوە بۆئەوەی وەک منیان لێنەیەت.

## کۆمەڵێك هۆکار هەن دەبنە ڕێگر لەبەردەم کچان:

- ئافتا و کەریمی تەمەن ٣٨ ساڵ وتی: زۆرێک لەو کچەقەیرانەی ئێستا ماونەتەوە، لەبەرچەند هۆکارێک ماونەتەوە، یان لەسەرەتا یەکێکیان خۆشویستووە، هەر چاوەڕێی ئەویان کردووەو دواجاریش بۆیان نەبووە، تا کاتێک زانیویانە تەمەن زۆری بەسەرچووە.

حاڵەتی دووەمیش زۆرێکیان سەرقاڵی خوێندنن بۆبەدەست هێنانی بڕوانامەی بەرز، ئەویش کاتی زۆری دەوێت و تا وای لێ دێت تەمەن دەڕوات و دواتریش داواکاریی وەک جاران نامێنێ و ڕەنگە زۆرجار خۆشی کەسێکی ڕا ڕای لێ دەربچێت بەحوکمی بیرکردنەوەی تەسکی ..

حاڵەتی سێیەمیش ئەوەیە، زۆرێک لە کچان لەسەرەتاکانی تەمەنیان، لەناو واقیعیەتی ژیانی ماددیدان و ئەوەش دەبێتە ڕێگر لەوەی بتوانن بە هەموو کەسێک رازی ببن، زۆرێک لەو کورانەی دەچنە بێش لێیان، ڕەتیان دەکەنەوەو

ئەوەی دەشیانەوێ رەنگە لە واقیعی ژیانیان وجودی نەبێت، تا وای لێ دێت تەمەن دەڕوات و دواتر ڕەنگە زۆریش تەنازول بکات بەڵام ئەو کەسە نییە، ئەوە بەشێوەی گشتی بەڵام ئەگەر بەتایبەتی بڕوانین رەنگە هەر کچێکو کێشەی تایبەتی خۆشی هەبێت، چونکە کۆمەڵگەی ئێمە پێکهاتەو بیرکردنەوەو گیروگرفتی زۆرتر لەبەردەم کچان دروست دەکات و بەشێکیش لەو گرفتانە دواجار دەبنە کەبت کردنی کچ لەسەرەتاکانی تەمەنی. بەشێوەیەکی گشتی کچانی قەیرە کێشەی رۆحیان هەیە، لە فەراغی رۆحی زۆر نالەبار دەژین کە دواجار رەنگە نەتوانن ئەو فەراغە بەئاسانی پڕبکەنەوە.

## قەیرەیی لەکۆمەڵگەی باوکسالاریدا

شیلان عوسمان تەمەن ٣٩ ساڵە دەڵێت: کچ هەیە کاتێک تەمەنی بەسەرچووە، هەموو ئەو شتانەی لەسەرەتای ژیانیدا گەورەترین خەونی بووە، وەک ماڵ و خانو و سەیارەو شەهادەو بێداویستیەکانی ژیان، کاتێک دەگات بە ئەقڵی تەواو، تێدەگات ئەوانە وەسیلەن، بەڵام پێداویست نین بۆ رۆحی مرۆڤ، بۆیەش ئەو کاتانەی کە تێدەگەن هەست بەپەشیمانی دەکەن و لە بۆشایی رۆحی و جەستەیی نالەباردا ژیان بەسەر دەبەن، کە زۆرجار رەنگە نەتوانێ بە دەربڕینی وشەش گوزارشت لەو شتانە بکات، لەبەر ئەوەی پێکهاتەی ئێمە کۆمەڵگەیەکی دواکەوتووە بەڵام ناشبێ ئەوە لە بیر بکەین، کۆمەڵگەی ئێمە کۆمەڵگەیەکی پیاو سالارییە، هەمیشە پیاو زاڵ بووەو هیچ کات بۆ پیاو کێشە نەبووە بۆ ئەوەی بۆشایی خۆی پڕبکاتەوە بەڵام بۆ کچ ئەوە کێشەیەکی گەورەیە و هەمیشە کچ قوربانی قەیرەیین و کوڕان کێشەی ئەوەیان نەبووە جگە لەوەش لەکۆمەڵگەی ئێمە کچ زۆرترن لەکوڕان و پەرلەمانیش بڕیاری ئەوەی دا کە دوو ژنی نەمێنێت و ئەوەش هۆکارێکە بۆ زۆربوونی قەیرەیی، جگە لەوەی زۆرترینی ئەو کوڕانەی سەفەریش دەکەن و نایەنەوە.

## قەیرەیی بۆتە دیاردەیەکی باو لەنێو کۆمەڵگەدا

خاتوو شیلان عومەر وتی: قەیرەیی ئەمڕۆ بۆتە دیاردە لەبەر ئەوەی یەکێک لەوچارەنووسانەی هەموو تاکێک پیایدا تێپەڕدەبێت پرۆسەی هاوسەرگیریە، بەڵام ژیانی هاوسەرێتی لەناو کۆمەڵگای ئێمەدا وەک پشت و پەنایەک وایە بۆ ئافرەتان بەڵام ئەی ئەگەر زەواجی نەکردبێت ئایندەی چۆن دەبێت، بۆیە دەبینین ئەگەر کچێک شووی نەکردبێت پێی دەڵێن قەیرە بووە و چارەنووسی ژیانی بەرەو ئاقارێکی دیکە دەڕوات، هەرچەندە قەیرەبوون لەکۆمەڵگای ئێمەدا تەنیا رەگەزی مێ دەگرێتەوە. ناوبراو وتی قەیرەی بەڕای من و زۆربەی شارەزایان دیاردەیەکی ترسناکە لە ئایندەیەکی نزیکدا هەڕەشە لەکۆمەڵگەدەکات .

## ڕێژەی قەیرەیی کچان

لە عێراق ٧٠%ی تێپەڕاندووە و هۆکارەکانی ئاشکرا دەکرێن. بەپێی راپۆرتێکی (سکای نیوز)، ژمارەی ژنان لە عێراق لە ١٨ ملیۆن تێپەڕیوە و ڕێژەی کچانی قەیرەش لە ٧٠%ی کچان تێپەڕیوە.

هەروەک لە راپۆرتەکەدا هاتووە، هۆکارەکانی قەیرەیی کچان لە عێراق، بریتین لە:

أ. بێکاریی کوڕان.
ب. کۆچی کوڕان بۆ دەرەوە.
ج. کوژرانی کوڕان لە شەڕەکان.
د. جیاوازیی ئاستی خوێندەواریی کچان و کوڕان لە کۆمەڵگە.

سکای نیوز بە پشتبەستن بە ئامارە نافەرمییەکانی ڕێکخراوەکانی تایبەت بە ئافرەت، ئاماژەی بەوە کردووە، کە تەمەنی هاوسەرگیری لە عێراق بەرز بووەتەوە و گەیشتووەتە نزیک ٤٥ساڵی.

## ئایا هێنانی ژنی دووەم لەلای پیاوانەوە چارەسەرە..؟

بڕیارەکەی پێشووی پەرلەمان هۆکارێکی سەرەکی زیادبوونی قەیرەییە،ئەمە باوەڕی خاتوو شەهپاڵ عومەر بوو ناوبراو وای دەبینی کەڕێژەیەکی زۆری ئافرەتان ئەمڕۆ لەهەرێمی کوردستاندا بوونەتە قەیرەکچ لەبەرئەوەی کەپەرلەمانی کوردستان یاسای فرەژنی دەرکرد چونکەفرەژنی تاکە ڕێگەچارەبوو بۆکەمککردنەوەی قەیرەیی لەهەرێمی کوردستاندا،لەبەر ئەوەی کە ئێستا پیاوان ناتوانن ژنی دووەم بهێنن، ئێمەش بووینەتە قەیرەو کەس نامانهێنێت، من داواکارم لەپەرلەمان یاسایەک دەربکات هانی فرەژنی بدات بۆئەوەی کەچیتر قەیرەمان نەمێنێت.

خاتوو نیان کەفەرمانبەرەلەوەزارەتی کاروکاروباری کۆمەڵایەتی وتی جوانییەکەم بۆتە هۆی قەیرەبوونم چونکەمن ئەو کاتەی کەقوتابی کۆلێژ بووم لەبەرئەوەی کەزۆرجوان بووم لەهەموو کچانی تری کۆلێژەکەمان جلوبەرگی جوانترم لەبەر دابوو و بەجۆریک هیچ کەسێک نەدەهات داوای پێوەندی خۆشەویستیم لێبکات کەس نەیدەوێرا بێتە داوام و هەمیشە هەر بەتەنیا بووم، ناوبراو وتی من تا قوتابی کۆلێژبووم زۆرخۆم بەگەورە دەزانی چونکە لەمنداڵییەوە ئەوەندە ماڵی باوکم وتووبویان تۆزۆر جوانی وام لێهاتبوو کەخۆم لەهەموو کەس بەجوانتر بزانم وببم بەکچێکی لووتبەرز تا لەئەنجامدا بوومە کچێکی قەیرە.

خاتوو ژیان دەڵێت: ئێمە ماڵمان لەگەڕەکێکی میللی شاری هەولێربوو لەبەر ئەوەی کەس بەمن رازی نەبوو بێجگە لەوەش، نۆ برام هەبوو، هەمیشە دایکم پێی دەوتم کچی خۆم تۆ نابێت شووبکەیت دەبێت چاوەڕێ بکەیت هەتا براکانت گەورەدەبن مەسرفیان بکەیت، دەبێت شوو بەکەسێک بکەیت کە رازی بێت تۆ مەسرەفی براکانت وماڵی باوکت بکات ئەگەرنا نابێت

شووبکەیت، دەبێت چاوەڕێ بکەیت تا ئەوان گەورەدەبن، من هەموویانم گەوەرەکرد ، ئێستا بوومەتە قەیرەکچ .

- خاتوو سەوسەن وتی: من بەهۆی عاشق بوونمەوە بەکوڕێکی دراوسێمان ئاوهام لێهات کوڕێک هەبوو لەگەڕەکەکەماندا، قەناعەتی بەمن کردبوو کەمنی خۆشدەوێت وحەزدەکات بێتە داوام تالەئەنجامدا دەسخەڕۆی کردم و منی کردە قەیرەکچ، من ئەوەندە دەڵێم کچان ئاگاداری خۆیان بن و نەکەونە داوی خۆشەویستی هیچ کوڕێک،چونکە کوڕان هەمیشە دەستیان دەبڕن ئێمەی کچ بەلای ئەوانەوە وەک کاڵایەک وەهاین،بەدەستی پیاوانەوە و بەئارەزووی خۆیان کاتمان پێدەبەنەسەرو پاشانیش کەپیردەبین کەس نامانهێنێت.

## دابونەریتی کۆمەڵایەتی ڕۆڵێکی سەرەکی هەیە بۆ قەیرەکچی

توێژەری کۆمەڵایەتی رەمزیە زانا دەڵێت: من وەک توێژەر لەگەڵ ئەم زاراوەیە نیم، چونکە وەکو هەست بریندارکردنێکە بۆ ئەو کچانەی کە تەمەنیان لەسی ساڵی بەسەرەوەیە، لەوانەیە هۆکاری زۆریان هەبووبێ بۆ مانەوەیان یان شوونەکردنیان لەوانە باری ئابووری کە ڕۆژانێکی زۆرناخۆش هەبوون کاریگەرییەکی زۆری لەسەر لاوان کردو نەیانتوانیوە لەساڵی نەوەدەکانەوە پرۆسەی هاوسەرگیری پێکبهێنن هەر ئەمەش بوو وای کرد زۆرێک لەگەنجەکان بەرەو باری کەمدەرامەتی و دارایی ڕۆیشتن و ئەمەش وای کرد هەلی هاوسەرگیری کەم ببێتەوە،هۆکارێکی تر ئەوەیە کە هەندێک لە کچان لەبەر هۆکاری خێلایەتی کە گوایە دەبێت کچەکە تەنیا لەچوارچێوەی خێزانی خۆی هاوسەری ژیانی خۆی دیاری بکات زۆرجار ڕێکەوت هەیە بەلام لەبەر دابونەریتی خێزانی ڕێی پێ نادەن لەدەرەوەی خزمەکانیی ژیانی هاوسەری پێک بهێنێت و لەناو ئەوانیش کەسی گونجاو نابینێتەوە..

هۆکاری تریش کچەکان خۆیانن کە بۆبڕوانامەی بەرز ژیانی هاوسەرییان دوادەخەن و کاتیان بەسەر دەچێت بەڵام ئەوە تەنیا لەکۆمەڵگای ڕۆژهەڵات دەبینرێت و لەکۆمەڵگای ڕۆژئاواشدا بەپێچەوانەوەیە ئافرەت سەربەستیەکی تەواوی هەیە بۆ ئەو کەسەی هەڵیدەبژێرێ بەبێ ڕەچاوکردنی هیچ شتێک، بەرای من ئێستا تا رادەیەک گۆڕاوە لەکوردستان پێشتر تەمەن زۆر پێوەر بوو دەەیانوت کچەکە بەبچووکی دەکەوێتە ژێر دەستی ماڵی خەزوورانی بەڵام ئێستا زەمەن گۆڕاوە بەتایبەت ئەوانەی فەرمانبەرن و بژێوی خۆیان دابین دەکەن نابێ واسەیری کچ بکرێ لە تەمەنێکی دیاریکراو شوو بکات بەڵکو پێویستە خۆی بەخۆی بە باوەڕەوە پرۆسەکە هەڵبژێرێ و هەندێکجار کچەکە دەبێتە قوربانی دایکی یان باوکی خزمەتیان دەکات و شوو ناکات تاتەمەنی بەسەر دەڕوات و دەکەوێتە ئەو حاڵەتەوە..

کەواتە ئێمە لەم ڕاپۆرتەوە وەڵامی ئەو پرسیارەمان دەستکەوت کە قەیرەیی چییەو قەیرە کێیە؟ وە باسی بەشێک لە هۆکارەکانی تێدابوو. بەڵام با بە خاڵ باس لە کۆمەڵێک لە هۆکارەکان بکەین بە کورتی لەوانە:

## دووەم: هۆکارەکانی دوا کەوتنی هاوسەرگیری:

١. کۆمەڵگا: ئەگەر یەکێک ویستی لەم جۆرە ئافرەتانە بخوازێ گرفتی بۆ دروستدەکرێ هەتا ئەگەر بۆ خێزانی دووەم و سێیەمیش بێ ، وە بەشێک لە هاوڕێکان و خزمان و ناساياو گازندە دەکا لەسەر ئەو هاوسەرگیرییە.

٢. هەڵتەکانی ڕەوشت و خێزان لە کۆمەڵگادا: دیارە هۆکارەکانی خراپەکاری لە بەردەم تاکەکانی کۆمەڵگادا بۆ هەردوو ڕەگەز وا لە مرۆڤدەکا کە پشت لە هاوسەرگیری بکا.

٣. نەریت و کلتوری کۆمەڵگا: جاری وایە لە ناو کۆمەڵگادا زۆر باو نییە کە لەم جۆرە پیاوو ئافرەتانە شووبکەن و ژن بێنن.

٤. هێرشکردنە سەر چارەسەرە دینییەکان: دیارە بۆ کۆمەڵگای مسوڵمان دەبێ بە هێزترین هۆکارو پاڵنەر دین بێ، بەڵام کاتێک ئەم چارەسەرە دینیانە ڕێگایان لێدەگیرێ یان گاڵتەیان پێدەکرێ و بە چاوی کەم سەیر دەکرێن گوومان لەوەدا نییە کە گرفتی دواکەوتنی هاوسەرگیری دروستدەبێ.

٥. ڕووبەڕوو بوونەوەی شوکردن لە کاتی خۆیدا.

٦. زیادەڕەوی لە مارەیی.

٧. ڕەفزکردنی کچان لە کاتی گونجاو بۆ هاوسەرگیری دەبێتە هۆی دواکەوتنی هاوسەرگیری.

٨. دواکەوتنی هاوسەرگیری بە هۆی بە خێوکردن و خزمەتکردنی باوک و دایک.

٩. چینایەتی ناڕەوا: هەندێک کەس لەبەر ئەوەی بواری کۆمەڵایەتیان بەرز نییە لە کۆمەڵگادا بە هۆی هەژاری، یان بنە ماڵە یان هەر هۆکارێکی تر، ناوو ناتۆرەی خراپ.

١٠. هەوڵ نەدانی کەس و کاری کچەکە یان کوڕەکە لە بە خۆ بەزلگری و پێ عەیب بوون.

١١. گوێنەدانی باوک و دایک و کەس و کار بە حاڵەتی ئەوانەی کە لە هاوسەرگیری دوا کەوتون پێیان وانییە شتێکی گرنگ بێ.

١٢. ڕابردووی  خرابی خێزانی کوڕەکە یان کچەکە.

١٣. هەندێک خێزان پێیان وایە ئەوەی گرنگە  بۆ کوڕو کچ تەنیا فێرکردن و بڕوا نامە بە دەست خستنە، بۆیە گوێ بە لایەنی هاوسەرگیری نادەن.

١٤. هەندێ خێزان دەڵێن دەبێ کچەکەمان تەنها شوو بە فلان کەس بکا، یان کوڕەکە دەبێ تەنیا فلانە کچ بێنێ، واش دەبێ ئەمانە یەکتریان بە دڵنابێ، یان ناگونجێ، یان کەسی باشتر هەیە لە کەسە دیاری کراوەکان.

١٥. سەرقاڵبوون بە خوێندن و بڕوانامە بە دەستهێنان و سەرقاڵبوون بە درس وتنەوە.

١٦. هەندێک جار هۆکاری جوانەبوون وەک پێویست، هەڵبەتە هیچ کەس ناشیرین نییە، مرۆڤ جوانترین  دروستکراوی خوایە: لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِيٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ (التين: ٤)

سوێند بەخوا بەڕاستی ئینسانمان دروست کرد لە جوانترین شێوەدا.

١٧. تێکچوونی شیوە لە ڕێی کارەسات و سوتان و ...

١٨. هەر بە سروشت هەندێک کوڕوو کچ گوێ بە هاوسەرگیری نادەن، لەوانەیە لاسایی خوشکی گەورە یان برای گەورە بکەنەوە.

١٩. هەندێک کەس لە بەر ڕەزیلی و دەست قوچاوی و خۆشەویستی ماڵ هاوسەرگیری ناکا.

٢٠. هەندێک لە ئافرەتان دەترسن سەربەخۆیی ماڵیان لە دەست بچێ.

٢١. ترسان لە بەرپرسیارەتی خێزان و منداڵ و ژیان.

٢٢. هەندێک بە پاڵنەری فەلسەفەی ڕووحی هاوسەرگیری ناکا، چونکە پێی وایە ئەمە کارێکی ئاژەڵانەیە بۆییە دەبێ مرۆڤ خۆی لێ بپارێزێ.

٢٣. هەندێک کەس لە بەر جیاوازی بیرو ڕاو مەزهەب شوو بە بەرامبەر ناکا، یان نایکاتە خێزانی خۆی. بۆ نموونە پێی وا ئەهلی بیدعەیە، یان سۆفی نییە، یان حیزببیە، یان حیزبی فلان نییە.

٢٤. هەیە بە بیانووی قیامەت و حۆری هاوسەرگیری ناکا، کە ئەمەش تێنەگەیشتنە چونکە پێغەمبەران سەلامی خوایان لەسەر بێ لە هەموو کەس زیاتر شەیدای بەهەشت بوون و هاوسەرگیریشیان کردوە.

٢٥. زیادەڕەوی کردن لە موسەفاتی کەسی بەرامبەر بۆ نموونە ، دەبێ ڕەنگی ئەوا بێ، قژی ئاوابێ، باڵای ئاوا بێ، دینداری ئاوابێ، تەمەنی ئەوەندە بێ...

٢٦. نواندنی وەفا بۆ کەسێک کە بەڵێنی پێداوە، کە لەوانەیە کەسەکە ژنی هێنابێ، یان شووی کردبێ، یان لە ژیاندا نەمابێ.]

کەسی گەورەتر لە و شووی نەکردووە یان ژنی نەهیناوە.

٢٨. کێشەی مناڵ نەبوون ، وا دەبێ کەسەکە تێستئ پزیشکی کردوە دەزانێ مناڵی نابێ بۆیە بڕیار دەدا ژن نەهێنێ یان شوو نەکا.

٢٩. ترسان لە جیابوونەوە.

٣٠. لە یەکتر بێزار بوون لە سەردەمی دەزگیرانی و متمانە بە یەکتر نەمان.

٣١. فریو خواردن بە جوانی.

٣٢. هەژاری.

٣٢. هەژاری.

٣٣. جادوو.

٣٤. چاوپیسی و چاوێنی

٣٥. زۆر تاوانکردن و توشبوونی خراپە، دیارە ئەمە بۆ هەندێک کەس ڕاستە.

٣٦. ژن هێنان یان شووکردن بە غەیری نەتەوەی خۆی، دیارە لەوانەیە ئەو ئاواتەشی بەدی نەیەت و توشی دواکەوتنی هاوسەرگیری ببێ

٣٧. بیانوو گرتن بەوەی کەدەبێ کەسی بەرامبەر بڕوا نامەی باڵای هەبێ.

٣٨. هەڕەشەکردن لە کەسی بەرامبەر کە بیکوژێ یان ئابڕووی بەرێ ئەگەر شوو بەو نەکا، یان ئەگەرکوڕەکە کەسیتر بخوازێ

٣٩. کچەکە بە بچوکی دەستدرێژی سکسی کراوەتەسەرو لێی بۆتە کێشەی دەرونی.

٤٠. نەخۆشی دەرونی.

٤١. سەرقاڵ بوون بە گەڕان و سەفەر.

٤٢. بە هۆکاری زیندانی کران.

٤٣. بە هۆکاری چوونە هەندەران.

دیارە بەشی زۆر لەو هۆکارانە بۆ مانەوەو زۆربوونی بێوەژنەکانیش ڕاستە لە گەڵ هەندێک شتی تر وەک:

١. ترسان بە هۆی فەشەل لە هاوسەرگیری پێشتر.

٢. بە هۆکاری بوونی مناڵ.

٣. ڕێگری کەس و کار.

٤. نەریتی کۆمەڵگا.

٥. هەرەشە بە لێستانەوەی مناڵەکان.

٦. سەربەخۆیی دارایی.

٧. دامرکاندنەوەی ئارەزووەکان لە ڕێی ناشەرعی.

٨. گەورەبوونی مناڵەکان.

٩. بە بیانووی وەفا بەرامبەر هاوسەری پێشوو.

١٠. قەبوڵنەکردنی چەند ژنییەتی.

١١. بارگرتن بە تەنیایی.

١٢. لەم ڕێیەوە دارایی دەستدەکەوێ.

١٣. لە بەر بە تەمابوونی کەسێکی دیاریکراو کە ئەو کەسەش ناتوانێ هاوسەرگیری لەگەڵدا بکا.

١٤. لە بەر بواری یاسایی کە ڕێگرە لە چەند ژنییەتی.

١٥. لە بەر میدیایی ئامانجدار بۆ ناشیرنکردنی چەند ژنییەتی و شووکردنەوەی ئافرەتان.

١٦. بە پاڵەوان و ئازا وێناکردنی ئەوانەی شوو ناکەنەوە.

١٧. لە بەر ئەوەی تەمەنی تێپەڕیوە.

١٨. لە بەر ئەوەی سەرقاڵی و دەوامی هەیە...

دیارە هۆکار زۆرن بۆ دوا کەوتنی هاوسەرگیری لە لایەن کچان و ژنان، وە کوڕان و پیاوان، بەڵام ئەوانەم وەک نمونە باسکردن.

## بابەتێکی سەرنج ڕاکێش دەربارەی تەمەنی ئافرەتان لە زمانی عەرەبیدا

ئافرەتان بە پێی تەمەنە جیاوازەکان کۆمەڵێک ناوی جیاوازیان هەیە لەوانە:

١. الطفلة: واتە: مناڵ لە هەموو شتێکدا.

٢. الوليدة: تازە لە دایکبوو هەتا تەمەنی دوای مناڵی.

٣. الكاعب: تازە مەمک کردوو.

٤. الناهد: مەمکی لە کاعب گەورەتر بووە.

٥. المفلكة: لەوەی پێش خۆی گەورەترە و مەمکەکانی تەواو خڕبوون و پێگەیشتوون.

٦. المعصر:گەیوەتە ئەوپەری گەنجی.

٧. العانس: ئەوەی زۆر لە ماڵی باوکیدا ماوەتەوە.

٨. الخود: کچێکی ڕەوشت بەرز نەگەیوەتە نیوەی تەمەنی.

٩. المسلف: ئەو کچەی دەگاتە ٤٥ ساڵ.

١٠. النصف: ئەوەی دەگاتە نیوەی تەمەنی.

١١. الشهلة: ئافرەت کە دەکشێ بۆ تەمەنی کامڵبوون.

١٢. الكهلة: کاتێک موی ڕەش و سپی تێکەڵاو دەبێت.

١٣. الشهبرة: بە ساڵاچووە، بەڵام خۆ گرتوویە و بە هێزماوە.

١٤. الحيزبون: کاتێک کە هێزی کەمدەکات.

١٥. القلعم: تەواو پیربووە.

١٦. اللطلط: تەواو بە ساڵاچوەو بێ هێز بووە.

## پرسیاری دووەم : ئایا بە چ تەمەنێک دەوترێ قەیرە؟

دیارە ئەم پرسیارە وەڵامی جۆراو جۆری هەیە، بێگوومان بە پێی ژینگە و کەلتوریش دەگۆڕێ، ئەگەر کەسێک لە تەمەنی ٣٥ساڵی تێپەڕاند دەڵێن قەیرە، ئەمە لە زوودا دەتوانین بڵێین ڕاستبوو، چونکە کچان چانسی شووکردنیان زۆر بە هێزبوو، گرفت و قەیرانەکان بەو شێوەیە نەبوو، گەنجان ئەوەندە نەڕۆیشتبوون بۆ هەندەران، باری دارایی باشتربوو، ئەوکات بە دەگمەن کچێک دەگەیشتە ئەم تەمەنە کە شووی نەکردبا مەگەر خۆی نەیویستبا، یان گرفتی دەروونی هەبایە.

## پرسیاری سێیەم: کێ تەمەنی قەیرەیی دیاریدەکات؟

ئێمە بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە یان دەبێ بگەڕێینەوە:

١) بۆ شەرع.
٢) یان یاسا.
٣) یان کۆمەڵناسان.
٤) یان نەریت.

ئایا ئەوانە بە تەحدید و دیاری کراوی باسی تەمەنی قەیرەییان کردووە؟

من وانازانم شتێکی ڕوونی ئەوتۆ هەبێ لەو بارەوە. ئەگەر کەسێک زانیاریەکی ڕوونی لەسەر دیاری کردنی تەمەنی قەیرەیی لایە بە پێی ئەوانەی کە باسمانکرد با ئاگادارمانکاتەوە سوپاسی دەکەین.

لە شەریعەت و لە یاسا باسی کەمترین تەمەن کراوە بۆ هاوسەرگیری، واتە: نابێ لەو تەمەنە کەمتربێ نەوەک زۆرترین تەمەن، نە لە شەریعەتدا نە لە یاسادا شتێکمان نییە تەمەن دیاری بکات، بۆ هاوسەرگیری لە ڕووی

گەورەییەوە، چونکە هەر تەمەنێک دەتوانێ هاوسەرگیری بکات، هەر چەند بە تەمەنیش بێ، ئەمە بۆ هەردووک ڕەگەز ڕاستە.

## پرسیاری چوارەم: ئایا قەیرەیی بۆتە گرفت؟

بێ گومان گرفتێکی گەورەیەو هەموو مافناسان و شەرعزانان و کۆمەڵناسان و هەتا خودی قەیرەکانیش وەک گرفتی ڕاستەقینە باسی دەکەن و باس لە چارەسەری دەکرێت.

## پرسیاری پێنجەم: ئایا بەکارهێنانی وشەی (قەیرە) باشترە، یان بوترێ دواکەوتنی هاوسەرگیری؟

بەڕاستی وا هەستدەکرێت وشەی (قەیرە) بۆ کچان تا ئەندازەیەک ئازار بەخشە، گوومان لەوەدا نییە کە بگۆڕدرێ بە وشەیەک کە ئازار بەخش نەبێ شەرعیترو جوانترە.

چۆن لە کاتی خۆی وشەی کوێر باوبوو، گۆڕا بە نابینا، زۆر جوانتربوو. کەمئەندام گۆڕا بە خاوەن پێداویستی تایبەت جوانتربوو. وشەی کەڕ گۆڕا بە نەبیست زۆر جوانتربوو. وشەی شێتی گۆڕا بۆ نەخۆشی دەروونی زۆر ئەهوەنتر و باشتربوو.

گوومان لەوەدا نییە کە وشەی قەیرە بگۆڕدرێ بە وشەی دواکەوتنی هاوسەرگیری یان هەر وشەیەکی تر باشترو شەرعیترە.

## پرسیاری شەشەم: ئایا سەربەخۆیی ماددی گرفتی قەیرەیی چارەسەر دەکات؟

گومان لەوەدا نییە کە دەتوانی بەشێک لە گرفتی ماددیی بۆ ئافرەتانی بە تەمەن چارەسەر بکات، بەڵام گرفتەکە لەوە گەورەترە کە تەنیا بە مادده چارەسەربکرێ، بۆیە دەبێ گرفتەکە لە ڕیشە و قسەی لەسەر بکرێت و چارەسەر بکرێت.

## پرسیاری حەوتەم: ئایا وشەی قەیرە تایبەتە بە کچان یان دەکرێ بۆ کوڕانیش بە کار بهێنرێ؟

تا ئێستا ئەم ووشەیە زیاتر بۆ کچان بە کار هاتووە، بەڵام دەکرێت بۆ کوڕانیش بەکاربهێنرێت، چونکە هەمان کێشە و هەمان گرفتە، بەڵام جیاوازییەکە لەوەدایە کە گرفتەکە زیاتر ڕووی لە کچانە نەوەک لە کوڕا.

## دووەم: لێکەوتەکانی دواکەوتنی هاوسەرگیری

دواکەوتنی هاوسەرگیری بۆ خانمان کۆمەڵێک لێکەوتە و شوێنەواری دیاری دەبێ، ئەم شوێنەوارانە :

١) به شێکیان پەیوەندیان هەیە بە لایەنی لاشەیی کچەکەوە.
٢) بەشێکیان پەیوەندیان هەیە بە لایەنی دەرونی کچەکەوە.
٣) بەشێکیان پەیوەندیان هەیە بە لایەنی کەس و کاری کچەکەوە.
٤) بەشێکیان پەیوەندیان هەیە بەلایەنی ڕەوشت و ئاکاری کۆمەڵگاوە.

### ١) سەرەتا شوێنەواری لاشەیی لایەنی کچەکە

دیارە دواکەوتنی هاوسەرگیری بۆ کچان کۆمەڵێک شوێنەواری لاشەیی و تەندروستی هەیە لەوانە:

أ. پوکانەوە.
ب. تێکچوونی دەم و چاو.
ت. لاوازبوون.
ث. نەمانی کچێنیەتی.
ج. سپی بوونی مووی سەر.
ح. کۆمەڵێک گرفتی تەندروستی و گۆڕانکاری دیکە.

### أ. پوکانەوە:

دکتۆرە فەوزییە دریع دەڵێ: ئافرەت کە شووی نەکردبێت و تەمەنی چووبێتە پێش هەموو خولەکێک هەست بە ئازار دەکا، بەڵام لە هەندێک کاتدا زیاتر وەک:

- کە هاوڕێیەکی شوو دەکات هەستدەکات ئەو ماوەتەوە بە تەنیا، وەک بڵێی شەمەنەفەری هاوسەرگیری ئەوانی تری سوارکردو ئەو بە جێ هێشت.

- کاتێک کە هاوڕێیەکی مناڵی دەبێ دیسان ئەوەش ئازارێک بۆ ئەو دروستدەکا کە لەم بەهرەیە بێبەشە.

- لە کاتێک کە سوری مانگانە دەبینێ ئاگادارکردنەوەیە بەوەی وردە وردە هێلکۆڵەکانی ماڵئاوایی دەکەن.

- لە کاتی یادکردنەوەی لە دایکبوونی هەستدەکا کە ساڵێکی تری خستە سەر تەمەنی.

- میدیاو شۆسیال میدیا بە هەموو شێوەکانیەوە زیاتر خەم دەخاتە سەر خەرمانی خەمەکانی بە هۆی نیشاندانی جوانی و لیاقەی ئافرەتان و باسکردنی لایەنی زانستی دواکەوتنی هاوسەرگیری.

- لە کاتی بیستنی وتارو نوسین ولێکۆڵینەوەی کە لەو بوارەوە دەکرێ، لە ڕاستیدا من بە ئازارو پەرۆشەوە ئەوە دەنوسم بەس مەبەستم دیاریکردنی کێشەکەیەو چارەسەرکردنیەتی، بۆیە زۆر داوای لێبوردن لە و خوشکە بەڕێزانەم دەکەم کە ئەو دەرفەتەیان بۆ نەڕەخساوەو نەچونە ماڵ و ژیانی تایبەتی خۆیان.

دکتۆر موحەمەد رەواشیدە: دکتۆری چارەسەری دەروونی دەڵێ: دواکەوتنی هاوسەرگیری کۆمەڵێک گرفت و ئاریشەی لە گەڵدایە، بۆ نمونە ئەگەر ئافرەتێک لە تەمەنی چل ساڵی و بە سەرەوە شو بکات ئەگەری ئەوەی هەیە کە منداڵەکەی تەندروست نەبێ، وە بەشێک لەوانەی کە دوای تەمەنی ٣٥ ساڵی منداڵیان دەبێ بۆی هەیە لە ٢٦٠ حاڵەتی لە دایک بوون یەکێکیان مەنگۆل دەربچێ، وە دیارە گرفتی تریشی هەیە ئەوە هەر وەک نمونە باسمانکرد. دیارە یەکێک لە دیارترین هۆکارەکانی پووکانەوە خەمخواردن و بە نەرێنی بیرکردنەوەیە.

## ب. تێکچوونی دەم و چاو

گومانی تێدا نییە کە دڵخۆشی و ئارامی و خواردنی باش و ژینگەی پاک و... کاریگەری زۆر ئەرێنییان هەیە لە سەر جوانی دەم و چاو و بە گەشی و پاراوی هێشتنەوەی، هەر بۆیە خەڵکی بەهەشت هەمیشە بە جوانی دەمێننەوە لە بەر ئەوەی لە خۆشی و ئەوپەڕی ئارامیدا ژیان بەسەر دەبەن وە بە پێچەوانەوە خەمخواردن و نائارامی و خواردنی خراپ و ژینگەی خراپ دەم و چاوی مرۆڤ تێکدەدات.

خوای گەورە دەفەرموێ: وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾(القيامة)

زۆر ڕوخسار لەو ڕۆژەدا گەشاوەن (٢٣) تەماشای پەروەردگاریان دەکەن.

وە بەهەشتیەکان دەڵێن: وَقَالُواْ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَذْهَبَ عَنَّا ٱلْحَزَنَ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ (فاطر: ﴿٣٤﴾) وە ئەوان دەڵێن: هەموو سوپاس بۆ ئەو خوایە کە خەفەتی لابردین و نەیهێشت، بەڕاستی پەروەردگارمان لێبوردەی شایستەی سوپاسە.

وە خوای گەورە کاتێک باسی بێباوەڕان دەکات دەفەرموێ: ﴿وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ ۝٤٠ تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ ۝٤١ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَفَرَةُ ٱلْفَجَرَةُ ۝٤٢﴾ واتە: وە زۆر ڕوخسار لەو ڕۆژەدا، تەپوتۆزیان بەسەرەوەیە، لە داماویدا ڕەش داگیرساون، ئەوانە ئەوانەن کە بێ باوەڕ و گوناهکار و تاوانبارن.

## ت. لاوازبوون

ئەگەر مرۆڤ سەرنجی ئەو کەسانە بدات کە لە هاوسەرگیری دواکەوتوون دەبینی زۆربەیان لاواز دەردەکەون، بەڵام ئەوانەی شویانکردووە زۆربەیان گۆشتن و دامەزراو دەردەکەون و دەم و چاو گەش و پاراون، دیارە مەبەستمان لە لاوازیەکی بەرچاوە دەنا لەمڕۆدا خەڵکان کێبەرکێ لەسەر لاوازبوون دەکەن هەرچەندە مەرج نییە ئەمە ڕاستبێ و بە دڵی پیاوان بێ، بەڵام وەک مۆدێلێک بەسەر خەڵک دابڕاوە و ڕیکلامی بۆ دەکرێت.

## ث. نەمانی کچێنیەتی

دیارە ئەمە بۆ هەموو کەسێک ڕاست نییە، بەڵکو ئەم شتە بە دەگمەن ڕوودەدات.

## ج. سەرسپی بوون

دیارە سەرسپی بوونیش هۆکاری زۆرە لەوانە:

- بۆ ماوەیی (الجينات، او الوراثة).
- نەخۆشی هۆرمۆنی.
- نوقساني لە ڤیتامینەکاندا.

- فشاری دەروونی.
- ترس.
- بە ساڵاچوون.

دیارە ئەو کەسانەی لە شەمەنەفەری هاوسەرگیری بە جێماون زیاتر و زووتر ئەمەیان لێدەردەکەوێ.

## ح. شوێنەوارە دەرونییەکان بە هۆی دواکەوتنی هاوسەرگیری

لەوانە:

- خەمۆکی و دڵەڕاوکێ.
- شەونخونی.
- ترس.
- بەدگومانی و بیرکردنەوەی خراپ.
- تێڕوانینی کۆمەڵگا بە شێوەیەک بۆ ئەو کەسەی دواکەوتووە لە پرۆسەی هاوسەرگیری.
- تووشبوون بە نەخۆشی ئێرەیی.
- خۆکووشتن.
- نقوومبوون لە هیواو ئاوات.
- پەنابردن بۆ فاڵچی و جادوگەرەکان.
- تووشبوون بە تاوان و سەرپێچی.

- بێ هیوابوون.

دیارە ناکرێ بڵێین ئەم نیشانە دەرونیانە بۆ هەموو کەس ڕاستن ،چوونکە کەسی وا هەیە دەتوانی بە هۆی بەرزی باڵانسی ئیمانی ڕوو بەڕووی زۆربەی ئەو گرفتانە بێتەوەو ئەوەندەی پێوە دیار نەبێ.

## سێیەم: شوێنەواری دواکەوتنی پڕۆسەی هاوسەرگیری لەسەر کەسوکاری کەسەکە

گومان لەوەدا نییە کە نزیکانی ئەو کچەی یان ئەو کوڕەی لە هاوسەرگیری دواکەوتووە زۆر کاریگەرو دڵتەنگن بە م حاڵەتە، دیارە هیوایەتی هەر باوکو دایکێک ئەوەیە کە مناڵەکانی بەسەر بەرزی بە جێگای خۆیان بگەن و ببنە خاوەنی ماڵ و مناڵی خۆیان، وە ببینی ئەو کوڕو کچانە بەو شێوەیە خۆی لە خۆیدا ئازارو خەمە، دیارە هۆکاری ئەم دەردە کوشندەیەش زۆرە و پێویستی بە چارەسەری وردو قووڵ هەیە لە لایەن هەموو ئەو کەس و دەزگایانەی کە پەیوەندیدارن بەمەوە.

## چوارەم: شوێنەواری دواکەوتنی هاوسەرگیری لە سەر کۆمەڵگا

لە ڕاستیدا کۆمەڵگا یەکەیەکی خێزانی گەورە و فراوانە، هەموویان بە هۆی چەندین شتەوە بە یەکەوە بەستراونەتەوە لە گرنگترینی ئەو شتانە:

١. هاوزمانی.
٢. هاوئایینی.
٣. هاوژینگەیی.

بەرژەوەندی هاوبەش و زۆر شتی تر وەک لایەنی ئابوری و ڕامیاری و...

١) دواکەوتنی هاوسەرگیری دیاردەیەکە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لەو کۆمەڵگایەدا هاوکاری و هاریکاری لاوازە، دەنا دەبوو ئەم دیاردەیە بەو شێوەیە نەبێ و چارەسەرکراباو لێکەوتەکانی کەمکرابانەوە.
٢) نیشانەی لاوازی دینداریە: ئەمە بۆ هەردووک ڕەگەز ڕاستە بەڵام زیاتر بۆ ڕەگەزی مێ کە زۆر زیاد لە پێویست هەستیارن بە چەند ژنییەتی، وە پیاوانیش بە دووی چارەسەری کێشەکەوە نین ئەوەندەی بە دوای ئارەزوو بازیەوەن و دەیانەوێ تەنیا لە گەڵ کەم تەمەنەکان هاوسەرگیری بکەن.
٣) پەیدابوونی خراپەکاری لە ناو کۆمەڵگادا: دیارە لەمڕۆدا خراپەکاری بەتایبەت بەد ڕەوشتی دوونیای تەنیوە بە هۆکاری ئەوەی سیستەمی جیهانی و سۆشیال میدیاو چەندین ناوەندو دەزگاو گروپ پشتیوانی لێدەکات و بازرگانی پێوە دەکات، لە وڵاتە لاوازەکان مەرجی هاوکاری ئەو دەوڵەتە زلهێزانە بۆیان بڵاوکردنەوەی بەد ڕەوشتی و نێربازی و چەند کاری نامرۆڤانەی ترە.
٤) پەیدابوونی چەندین نەخۆشی ترسناک لە کۆمەڵگادا کە بەشێکی بەرچاو لەو نەخۆشیانە شێرپەنجەی ترسناکن کە ئەستەمە بە وڵاتە هەژارەکان چارەسەر بکرێ، بگرە هەر دەرمانیشیان بۆ دابین ناکرێ.
٥) ئافرەتان دەبنە موزاحم بۆ پیاوان دەربارەی هەلی کار: چونکە ئەگەر کچەکان هەلی کاریان بۆ بڕەخسێ ئەوە لەسەر حیسابی پیاوانە، دواتر پیاوان ناتوانن لە بەر بێکاری هاوسەرگیری بکەن، ئێمە ناڵێین با ئافرەت دانەمەزرێ و هەلی کاری بۆ نەرەخسێ، بەلام بۆ چارەسەری کێشەی دواکەوتنی هاوسەرگیری دەبێ ئەولەویەت بۆ ڕەگەزی نێرینە بێ بۆ ئەوەی لێکەوتەی زیاتری بە سەر ئافرەتانەوە نەبێ.
٦) پەیدابوونی چەندین جۆری هاوسەرگیری لەوانە:
   ١. هاوسەرگیری موتعە.
   ٢. هاوسەرگیری کاتی.

٣. هاوسەرگیری فرێند.
٤. هاوسەرگیری مسیار.
٥. هاوسەرگیری مەدەنی.
٦. هاوسەرگیری بە دزی.
٧. هاوسەرگیری عورفی.

٧) لە کتێبی (تاوانی زینا) دا ئاماژەمان بە جۆرەکانی هاوسەرگیری و حوکمەکانیان کردووە، کە ئەگەر هاوسەرگیری بە ڕێگا ئاساییەکەی خۆی بەڕێوە نەچی ئەوکات کۆمەڵگا بیر لە چارەسەریتر دەکاتەوە، هەتا با لە ڕاستیدا چارەسەریش نەبێ و گرفت بێ.

٨) لاوازبوونی هاوسەرگیری شەرعی: چونکە ڕێگای تر لە بەردەم کۆمەڵگادا دەکرێتەوەو گەنج ناچێتە ژێرباری بەرپرسیاریەتی.

## پێنجەم: لێکەوتەکانی دواکەوتنی هاوسەرگیریکردنی بێوەژنەکان لەسەر کۆمەڵگا

دیارە ئەم بوارەش هەر وەک بابەتی پێشووتر وایە کۆمەڵێک لێکەوتەو شوێنەواری نەرێنی هەیە بۆ سەر خودی کەسەکەو کەس و کارو کۆمەڵگاو منالە بێ باوکەکان یان دابراو لە دایک و باوکەکان. کۆمەڵگا بە گشتی دوو ئاراستەی پێچەوانەی وەرگرتووە:

یەکەم: لە هاوسەرگیری ساردبۆتەوە .

دووەم: ڕێژەی جیابوونەوە لە زیادبووندایە.

ئەم دوو ئاراستەیە هەردووکی زیان بە خێزان و کۆمەڵگا دەگەیەنێ ، دیارە هۆکاری زیادبوونی ڕێژەی بێوەژن جا بە هۆی تەڵاقەوە بێ یان بە هۆی وەفاتەوە بێ زۆرە، بەڵام لە دیارترین هۆکارەکانی:

١. لاوازی لایەنی دینداری: چونکە ئەگەر کەسێک بە دین بێ لە هەردووک ڕەگەز بە بێ هۆکارێکی بەهێزو شەرعی داوای جیابوونەوە ناکا، چونکە تەڵاقدان یان داوای تەڵاق بێ هۆکار بێ شەرعیەو قەدەغەکراوە.

٢. جیاوازی دین.

٣. جیاوازی ئاستی ڕۆشنبیری.

٤. جیاوازی ئاستی کۆمەڵایەتی.

٥. جیاوازی جۆری پەروەردە.

٦. خراپ هەڵبژاردن و پەلە کردن.

٧. تورەیی لە سنور بەدەر.

٨. تێنەگەیشتن لە حوکمی تەڵاق و شوێنەوارەکانی.

٩. هاوڕێی خراپ.

١٠. دەست خستنەناوی کەس و کار بە خراپە.

١١. لاسایی کردنەوەی کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی.

١٢. بە هۆکاری خراپی بژێوی ژیان.

١٣. بە هۆکاری پەروەردەی مناڵ.

١٤. بە هۆکاری جوانی و ناشیرنی.

١٥. بە هۆکاری فریودانی کەسیتر .

١٦. بە هۆکاری کەم تەمەنی.

١٧. بە هۆکاری هاوسەرگیری دوای تەمەنی زۆر کە خۆشەویستییبو بە یەکەوە گونجانیان بۆ دروستنابێ.

١٨. بە هۆکاری وەزیفە.

١٩. بە هۆکاری چونە هەندەران.

٢٠. بە هۆکاری تەندروستی.

٢١. بە هۆکاری زیندانیکران.

٢٢. بە هۆکاری پێنەدانی مافی سەرجێی.

٢٣. بە هۆکاری چەند ژنیەتی.

٢٤. بە هۆکاری خیانەتی هاوسەرگیری.

٢٥. بە هۆکاری گرنگی بە خۆنەدان و بە بەرامبەر نەدان مەبەست هاوسەرە.

٢٦. بە هۆکاری خوێندن.

٢٧. بە هۆکاری دوژمنایەتی کەس و کار.

٢٨. بە هۆکاری سیاسی.

٢٩. مادده کحولی و هۆشبەرەکان.

٣٠. بەهۆکاری سۆشیال میدیا.

٣١. بەهۆکاری پابەند نەبوونی یەکێکیان بە دینداری.

٣٢. بە هۆکاری غیرەی زیاد.

٣٣. بە هۆکاری بوهتان.

٣٤. بە هۆکاری نە بوونی ژیان وماڵی سەربەخۆ.

٣٥. بە هۆکاری جادوو چاوێنی.

٣٦. بە هۆکاری مارەیی زۆر، مەبەستم ئەوەیە دوای دیاریکردنی مارەیی هێشتا مارەییتر داوا دەکرێ.

٣٧. بە هۆکاری داواکاری زۆر.

٣٨. بە هۆکاری گروپە فیمینستەکان .

٣٩. بە هۆکاری پەیدابوەنی جۆرەکانی تری هاوسەرگیری.

٤٠. بە هۆکاری گرفتی قەومایەتی و هۆزایەتی.

٤١. بە هۆکاری نەبونی گفتوو گۆ.

٤٢. بە هۆکاری ڕەچاونەکردنی ڕێنماییەکانی ژن تەڵاقدان.

٤٣. بە هۆکارەکارەکانی فەتوای هەڵە.

٤٤. بە هۆکاری ڕەدوو کەوتن.

٤٥. چاوپۆشی نەکردن لە هەڵەی یەکتر.

٤٦. بە زایا دانی پارەی هاوسەر بە نا پێویستی.

٤٧. بەخیلی و چروکی پیاو.

٤٨. بە هۆکاری گۆرینی دین.

٤٩. بە هۆکاری منداڵ نەبوون.

٥٠. بە هۆکاری یاسایی: وەک ئەوەی کە یەکێک ناچار کا بە جیابوونەوە دوای ئەوەی بە نایاسایی ژنی هێناوە وەک ژنی دووەم یان سێیەم یان چوارەم.

٥١. تەنیا لە بەرتاقیکرنەوەی تەڵاق.

دیارە هۆکار زۆرن بۆ جیابونەوە، ئەگەر باس لە بابەتی ئەوانە بکەین کە هاوسەریان وەفات دەکا دیارە دەبێ ئەوکات باسی هۆکارەکانی وەفات بکەیین کە پێویست ناکات، چونکە هۆکاری وەفات زۆرەو جۆراو و جۆرە.

# دەستپێک

**خوێنەری بەڕێز!**

دیارە بابەتێکی ئەوا گرنگ و مەترسیدار پێویستی بە چارەسەری ڕیشەیی و لێکۆڵینەوەی ورد و داتا و خەڵکانی پسپۆر دەکات لە زۆر بواردا کە پەیوەندیدارە بەو بابەتەوە، بەڵام وەک دەوترێ ( ئەوەی هەمووی نەکرێ هەمووی وازلێناهێنرێ) ئەگەر نە توانین ئەوەش بکەین دەتوانین هەندێک چارەسەر بخەینە بەردەست بەڵکو بۆ خوێنەر مایەی بەرچاوڕوونی و سوود وەرگرتن بێ لەو چارەسەرانە.

## چارەسەرەکان:

١. وەک پێشنیار ئەگەر بووترێ لەدەستدانی هاوسەر یان هەر وشەیەکی تر لەوانەیە گونجاوتر بێ، چونکە وشەی بێوەژن لە وانەیە ئازار بەخش بێ تا ئەندازەیەک، یان لەوانەیە بە چاوێکی کەم سەیر بکرێ.

٢. باشترین چارەسەر دەرگاکردنەوەیە بۆ چەند ژنیەتی ، بە مەرجی شەرعی و دروستی خۆی.

٣. ئاسانکاری لە دەسەڵات و وەزارەتی پەیوەندیدار بۆ هاوسەرگیری بە تایبەت بۆ ئەوانەی هاوسەریان لە دەستداوە بە هۆی کارەسات و وەفاتەوە.

٤. هاوکاریکردنی ئافرەتانی خاوەن مێرد: دەبێ ئافرەتان بزانن کە ئەوانەش بێ هاوسەرن وەک ئەوان مرۆڤن و مافی ژیان و هاوسەرگیریان هەیە، بۆیە دەبێ خۆیان ئاسانکاری بۆ پرۆسەی چەند ژنیەتی بکەن، نەوەک هەرەشەی جیابوونەوە لە هاوسەرەکانیان بکەن.

٥. دەبێ بزانین بە خێوکردنی مناڵی بێ باوک و کەفالە کردنی خێرێکی گەورەیە، پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: " كَافِلُ الْيَتِيمِ لَهُ أَوْ لِغَيْرِهِ، أَنَا وَهُوَ كَهَاتَيْنِ فِي الْجَنَّةِ ". وَأَشَارَ مَالِكٌ بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى.[٣٤]

واتە: ئەو کەسەی هەتیو کەفالە دەکا، پەروەردەی دەکات و بە خێوی دەکا، جا هی خۆی بێ یان هی غەیری خۆی من و ئەو لە بەهەشتا وەک ئەو دوو پەنجە واین، ئاماژەی کرد بە پەنجەی ناوەراست و شایەتمان، مەبەست ئەوەیە ئەو کەسە لای خوا پلەی بەرزو باڵایە.

---

[٣٤] - رواه مسلم، ٢٩٨٣

٦. ئەوەی کە توشی ئەم حاڵەتە بووە کەس و کاری من و تۆیە، کۆمەڵگای مسوڵمان وەک یەک لاشە وایە، دەبێ هەست بە ئازارەکانی یەکتری بکەین و بە خەم یەکەوە بین بە کردەوە.

٧. هاوکاریکردنی یەکتر لە سەر چاکە واجبە خوای گەورە دەفەرموێ: .. وتعاونوا على البر والتقوى... جا چ لەوە باشترە هاوکاربین بۆ نەهێشتنی گرفتی لە دەستدانی هاوسەران و برینەکانیان سارێژ کەین.

٨. دەبێ بزانین لێکەوتەی خراپ بەسەر کۆمەڵگاوە بە جێدەهێڵێ دواتر ئێمەش لە شوێنەوارە خراپەکانی بەدەر نین.

٩. بەدڕەوشتی ئاگرێکە هەموو تاکێکی کۆمەڵگا دەسوتێنێ بۆیە دەبێ بە گرنگیەوە بۆی بڕوانین و لە بیری چارەسەرەکەی دابین بەوەی کە لە تواناماندایە.

١٠. دەوڵەمەندەکان دەتوانن بەو سامانەی کە هەیانە کار بکەن بۆ ئاسانکاری هاوسەرگیری .

١١. نابێ شەرم بکەین لەوەی کە کەسێک بکەین بە هاوسەرمان کە پێشتر هاوسەری بووە، پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام خۆشەویسترین و یەکەم خێزانی خەدیجە بووە ڕەزای خوای لێبێ کە پێشتر دوو جار هاوسەرگیری کردووە.

١٢. ئەو ئافرەتانەش نابێ بترسن لە توانج و تەشەری کۆمەڵگاو کەس و کار، با زۆر بەسەر بەرزانەو بە ئاگاداری کەس و کاریان هاوسەرگیری بکەن و ژیانی ئاسایی خۆیان دروست بکەن.

١٣. با منداڵەکان ئەوانەی کە گەورەبوون و هەست بە بێکەسی و تەنیایی و گەنجایەتی دایکیان دەکەن نابێ ڕێگر بن لە هاوسەرگیری.

١٤. نابێ کەسوکار هەرەشەی لێستاندنەوەی منداڵەکان بکەن لەو ئافرەتەی کە دەیەوێ هاوسەرگیری بکا مادام بە خراپ ناشکێتەوە بە سەر منداڵەکاندا، یان لانی کەم ڕێگری بینینی منداڵەکانی لێنەکرێ کاتێک کە ویستی.

١٥. بە پێی وەزارەتی پلاندانانی عێراقی زیاتر لە ملیۆنێک و نۆسەد و پەنجا هەزار کەس بێوەژن و تەڵاقدراو هەیە بە بێ پارێزگای موسڵ و ئەنبار و هەندێک قەزای کەرکوک، دەی ئەم ئامارە ترسناکە دەبێ لە بیری چارەسەرکردنیدا بین!

١٦. دەبێ لە بیری ئەوەدا بین ڕێژەی منالی ناشەرعی لە کۆمەڵگادا زیاد دەکات، ئەمەش بۆخۆی زۆر مەترسیدارە و ئاماژەی خراپە.

١٧. بەشێک لە چارەسەر لە ئەستۆی فەلسەفەی حوحمڕانی ولاتە.

١٨. وەزارەتی پلاندان .

١٩. وزارەتی کاروباری کۆمەلایەتی.

٢٠. وەزارەتی پەروەردەو فێرکردن.

٢١. میدیا بە هەموو شێوەکانییەوە.

٢٢. ڕۆشنبیران .

٢٣. کۆمەڵناسان.

٢٤. پزیشکان.

٢٥. دەوری وەزارەتی ئەوقاف و مامۆستایانی ئاینی.

٢٦. دەوری پەرلەمان لە دەرکردنی چەندین یاسای جوان بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە.

٢٧. ڕێكخراوەكان دەوریان دەبێ لە چارەسەركردنی ئەم كێشەیە، دەیان و سەدان ڕێكخراو دامەزراوە بە ناوی ژنەوە با هەندێكیان كار بكەن لە سەر چارەسەری كێشەی ئەم توێژە زۆرە لە كۆمەڵگادا.

٢٨. چارەسەری ئابوری : چۆن وابكرێ ڕێگری بكرێ لەو هەموو گەنجەی كە لە نیشتیمان تووڕەیەو ڕادەكا، كە لانیكەم بەرامبەر هەر یەكێك لەو گەنجانە كچێك یان بێوەژنێك بێبەش دەبێ لە هاوسەرگیری.

٢٩. لە هەموو چارەسەرێك باشتر گەڕانەوەیە بۆ شەریعەت.

٣٠. پیرۆز نەكردنی نەریت و كلتوری هەڵە.

٣١. زاڵكردنی ژیری بەسەر لایەنی ترس لە توانج و پلار.

٣٢.ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو ڕێكخراوانەی بازار خۆشدەكەن بۆ یاخیبوونی ئافرەت.

٣٣. لە هەمووی گرنگتر خودی ئافرەتانن كە كاری جدی لە سەر بكەن.

٣٤. گومانی باش بە خوای گەورە بردن.

٣٥. كەس و كاری ئەم توێژە بە ئەركی خۆی هەڵبستێ بەرامبەر ئەو ئافرەت و پیاوەی لە خۆیان دەیانەوێ هاوسەرگیری بكەن.

٣٦. دڵنیابوون لە وەی ڕێكخراو و گروپە فیمینیستەكان فەشەلیان هێناوەو هیچ چارەسەرێكیان پێ نییە، بۆیە با ئافرەتان چاوەڕوانی شتی باشیان لێ نەكەن چونكە بەشێك لە ئەندامەكانیان خۆیان هەمان دەردیان هەیە، ئایا چۆن دەتوانن چارەسەری خەڵكانیتر بكەن؟!

٣٧. تێگەیشتن لە پیرۆزی و گەورەیی و گرنگی و ئامانجی هاوسەرگیری.

٣٨. دەرخستنی زیاتری لایەنە جوان و زانستی و کۆمەڵایەتی و ئابوری و تەندروستیەکانی هاوسەرگیری.

٣٩. نزاکردن و پاڕانەوە.

٤٠. تەقواو پارێزگاری هۆی دەرو کرانەوەیە.

٤١. بەستنی کۆنفراس و سیمینارو کۆبوونەوەی جەماوەری بۆ هاندان و چارەسەری ئەم بابەتە.

٤٢. حیزب و ڕێکخراوە ئیسلامییەکان کاری بەرچاوو گرنگ بکەن و پێشنیاری یاسای باش بکەن لە پەرلەمان بۆ چارەسەر کردنی ئەم گرفتە.

٤٣. هەرکەسێ پەرۆشی و دڵسۆزی نەبێ بەرامبەر بەم هەموو توێژە گرنگە دەبێ لە بەرپرسیاریەتی خۆی بکەوێتە گومانەوە، دەنا ناکرێ باسی مافی ئاژەڵ و دارو بەرد بکەین بەڵام باسی مرۆڤ نەکەین، وە ئەو مرۆڤەش کە ئافرەت بێ.[٣٥]

---

[٣٥] بڕوانە:

- عقبات الزواج وأخطارها الكبرى/ طارق بن عبد الواحد بن علي.
- العنوسة اسبابها ، آثارها، علاجها/الدكتور عبد المنعم عثمان عبد الله.
- العنوسة وكيف تعامل معها الاسلام/ دعاء ماجد/ محمود سلامة.
- العنوسة اسبابها وحلولها الشرعية/محمد عبد الله صالح القدح.
- العنوسة معاناة انسانية تهدد البناء الاجتماعي/نهى عدنان قاطرتي.

## ئازیزان!

بەکورتی  لەمپەرو کۆسپەی کە باسمان کردوە لە ڕێی هاوسەرگیری لە پاڵیدا باسی چارەسەرەکانیشمان کردوە، وە لەگەڵ ئەم چارەسەرانەی کە لەم بەشەشدا باسمان کردوە دەکرێ ئەمانە چارەسەری  بەشێک بن لە چارەسەری تیۆری بۆ کێشەی هاوسەرگیری، لە بواری کردەییشدا گومانی تێدا نییە کە پێویستمان بە چارەسەرو هەنگاوی ترە.

## کۆتایی بەرگی دووەم

لەمپەرەکانی بەردەم هاوسەرگیری و لێکەوتەو چارەسەرەکانی بابەتێکی گەورەو گرنگە، پێویستی بە دراسەو لێکۆڵینەوەی تیۆری و کردەییە.

١) لەم کتێبەدا تا ئەندازەیەک ئاماژەمان بە لەمپەرە سەرەکیەکانی بەردەم هاوسەرگیری کردوە.
٢) بە پێی توانا باسی لێکەوتە جۆراوجۆرەکانیشمان کردوە.
٣) باسی چارەسەرەکانیمان کردوە بە ئەگەر بە کورتیش بێ.
٤) ئەوەی کە من کارم لەسەر کردوە لەم بەرگەدا هەوڵێکی کەم و کورت و ناقابیلە، بەڵام هەردەبێ هەوڵی خۆمان بدەین تائەوکات هەوڵی باشترو وردتر و زانستیتر و واقعیتر دێتە ئاراوە.
٥) هیوامان وایە کە ئەم زنجیرەیە تەواو بێ ببێتە بە بەشێک لە چارەسەری گرفتەکانی خێزان و پرسەگرنگ و گەورەکانی ئافرەت و ڕەواندنەوەی گومانی بێ باوەڕان و ناحاڵیبوان لە دین.
٦) ئەم کتێبە چاپ نەکراوە بۆیە پێش چاپکردن هەرکەس پێشنیار و ڕەخنە و تێبینیەکی هەیەو ئاگادارمان کاتەوە ممنونی دەبم.
٧)

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

حەسەن عەلی

٢,٢٣/٦/٢٤ زایینی

٦/ذی الحجة ١٤٤٤ هجری

# سەرچاوەكان

دوای قورئانی پیرۆز:


١. صحيح البخارئ
٢. صحيح مسلم
٣. سنن ابوداود
٤. سنن الترمذی
٥. سنن ابن ماجه
٦. مسند أحمد
٧. تفسير القرآن العظيم /ابن كثير.
٨. الكتاب المقدس.
٩. القضاء والقدر/ آلدكتور عمر سليمان الاشقر.
١٠. المهر واحكامه/أحمد محمود رجب رجب
١١. من قضايا الزواج/جاسم محمد مهلهل
١٢. غلاء المهور واضراره/ عبد الله بن جارالله بن ابراهيم.
١٣. المختصر فی القواعد الفقهية/ صلاح الدين أحمد.
١٤. عقبات فی طريق الزواج/ محمد بن عبد الله الهبدان
١٥. العنوسة أسبابهاـ آثارهاـ علاجها/ عبد المنعم عثمان عبد الله
١٦. تأخر زواج الفتيات/ هارون عثمان.
١٧. العنوسة وحلولها الشرعية/ محمد عبد الكه صالح القدح.
١٨. أنوار التنزيل وأسرار التأويل/ الامام البيضاوی
١٩. فتح القدير/ الامام الشوكانی.
٢٠. تفسير السمعانی/منصور بن محمد بن عبد الجبار التميمی السمعانی.
٢١. عون الرحمن فی تفسير القرآن/ أ.د. سليمان بن ابراهيم بن عبد الله اللاحم.
٢٢. التفسير الصحيح ـ موسوعة التفسير المسبور من التفسير بالمأثور/ أ.د. حكمت بن بشير بن ياسين.
٢٣. الزواج المبكر وتحديد سن الزواج/ فهد بن محمد بن محمد الغفيلی.
٢٤. الزواج المبكرـ دراسه فی المفهوم والاسباب والآثار/ نوال عبد الرحمن حمزة.
٢٥. المرأة المسلمة بين غرائز البشر وهداية الاسلام/ دكتور صابر عبد الرحمن طعيمة.
٢٦. عقبات الزواج وأخطارها الكبرى في حياة أمتنا الاسلامية/. طارق بن عبد الواحد بن علي.
٢٧. عقبات في طريق الزواج/ محمد بن عبد الله الهبدان.
٢٨. يا بنتي / الشيخ علي الطنطاوي.
٢٩. عقبات الزواج وطرق معالجتها على ضوء الاسلام/ عبد الله ناصح علوان

٣٠. .موسوعة الزواج الاسلامي السعيد/ الشيخ محمود المصري.
٣١. مكتبة الاسرة المسلمة/ خالد عبد الرحمن العك.
٣٢. قواعد تكوين البيت المسلم/ الدكتور أكرم رضا
٣٣. - عقبات الزواج وأخطارها الكبرى/ طارق بن عبد الواحد بن علي.
٣٤. العنوسة اسبابها ، آثارها، علاجها/الدكتور عبد المنعم عثمان عبد الله.
٣٥. العنوسة وكيف تعامل معها الاسلام/ دعاء ماجد/ محمود سلامة.
٣٦. العنوسة اسبابها وحلولها الشرعية/محمد عبد الله صالح القدح.
٣٧. العنوسة معاناة انسانية تهدد البناء الاجتماعي/نهى عدنان قاطرتي.

# جێ باسەکان